حکومەتی هەرێمی کوردستان - عێراق
وەزارەتی پەروەردە
بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان

# جینۆسایدی گەلی کورد

بۆ پۆلی دەیەمی ئامادەیی
(زانستی، وێژەیی) و قۆناغی یەکەمی خوێندنی پیشەیی و پەیمانگەکان

**ئامادەکردنی**

ویسی صالح حمد امین　　　　عمر علی شریف
عبید خدر فتح الله

**پێداچوونەوەی زانستی و هەڵسەنگاندن**

د.یوسف معروف دزەیی

**چاپی سێیەم　　　٢٧١٥ کوردی　٢٠١٥ زایینی　١٤٣٦ کۆچی**

# ناوەرۆك

# پێشەکی

لەسەرەتای سەدەی بیستەم کە دەوڵەتی عێراق لە لایەن ئینگلیزەوە دامەزرا، پێکهاتەیەکی نامۆ و دوور لە ئارەزووەکانی گەلی کوردستان بوو ، بۆیە ئەم قەوارە نوێیە، بۆ چەسپاندنی پێگەی خۆی بەردەوام دانیشتوانەکەی توشی نەهامەتی و ماڵوێرانی و قەیران کردوە . دەسەلاٌتدارانی عێراق هەر لەسەرەتاوە بە هەموو شێواز و ئامرازێك سڵیان لە گۆڕینی پێکهاتەی نەتەوەیی و کەلتووری و کۆمەلاٌیەتی و رۆشنبیری و دیمۆگراف و جوگراف ناوچەکە نەکردۆتەوە، بە پەیرەوکردنی تاوانی راگواستن و بەعەرەبکردن و بەکارهێنانی هێز و سوپاو چەکی کوشندەی کۆمەڵکوژی قەدەغەکراوی نێودەوڵەتی و زیندانی کردن و شونبزرکردنی هاوولاٌتیانی سڤیلی بێتاوان و سوتاندنی رەز و باخ و گوند و شارۆچکەکان و لەناوبردنی ژێرخانی ئابووری ناوچەکە بۆ ئەوەی رۆڵەکانی ملکەچ بکات بۆ ویست و مەرامەکانی خۆیان .

دواجار لە کۆتایی هەشتاکانی سەدەی بیستەم، تاوانەکان لە سەردەمی بەعسیەکان گەیشتە لووتکەی دڕندایەتی بەرامبەر گەلی کوردستان ، کە دیارترینیان تاوانەکانی بەدناوی (ئەنفال)بوو، لە بەرچاوی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی دژ بە گەلی کوردستان ئەنجام درا . دەتوانین ئەم تاوانە بە گەورەترین تاوانی سەردەم هەژمار بکەین کە دەرهەق بە مرۆڤایەتی کرابێت لە کوردستان.

مەبەست لە ئامادەکردنی ئەم بابەتە، ناساندنی ئەم تاوان و رەشەکوژییە کە بەرامبەر بە گەلی کورد ئەنجام دراوە، بۆ ئەوەی نەوەکانمان رابهێنین و لە بیری نەکەن و بیکەنە وانەیەك بۆ داهاتوویان، کە بنیادی کۆمەڵگەی کوردستانی نوێی

لـه سـەر دابمـەزرێنین، دووربێـت لـە گیـانی رەگەزپەرسـتی و تونـدو تیـژی وهەڵسوکەوتی نامرۆڤانە دەرهەق بە هاونیشتمانیانی کوردستان .

بابەتی جینۆسایدی گەلی کورد لە شەش بەش پێکهاتووە ، بە پێی زنجیرەی مێژووی رووداوەکان جێگیر کراوە، لە سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق کـە بریتیـە لـە (بـە عـەرەبکردن و راگواسـتن، لـە نـاوبردنی کـوردە فەیلیـەکان، کۆمـەڵکوژی بارزانییـەکان، بـەکارهێنانی چـەکی کۆمـەڵکوژی ، ئـەنفال و قۆناغەکانی لە ناوبردن و کاریگەری بەسەر کۆمەڵگەی کوردستان .

لە ئامادەکردنی ئەم بابەتە رەچاوی بەشەوانەی دیاریکراوی وەرزی خوێنـدن کراوە ، کە سنووردارە، چونکە بابەتەکە تازەیە، لەوانەیە کەم وکوڕی تێدابێت، بۆیە داواکـارین لـە مامۆسـتایانی بـەرێز هـەر تێبـینی و سـەرنج و رەخنەیـەکیان دەربارەی بابەتەکە هـەبێت سوپاسـیان دەکـەین ئاگادارمـان بکەنـەوە، تـاوەکو بتوانین لە چاپی ئایندە سوودیان لێـوەرگرین. هیـوادارین توانیبمـان تارادەیـەك خزمـەتمان بـەو گیانـە بـێ تاوانانـە کردبێـت کـە بوونـە ئامـانجی مەرامـەکانی سیاسەتی درندانەی دەسەڵاتدارانی عێراق.

لـە کۆتایـدا سوپاسـی هـەموو ئـەو لایـەن و کەسـە دڵسـۆزانە دەکـەین کـە هاوکارمان بوون لە ئامادەکردنی ئەم بابەتە بـە تایبـەتی ( **وەزارەتـی کاروبـاری شـەهیدان و ئـەنفالکراوەکان و ئەنسـتیوتی کـوردی بـۆ ڤیکتۆمۆلـۆجی و بەرەنگاربوونەوەی جینۆساید و سەنتەری ئەنفال بۆ بە دواداچوونی ئـەنفالکراو وبێ سەر و شوێنەکانی کوردستان** )بە رێنمایی و سەرچاوە یارمەتیان داین .

**دەستەی ئامادەکار**

# بەشی یەکەم

## بەعەرەبکردن و راگواستن

### دەسپێك:

بیرۆکەی دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق، لە هەردوو ویلایەتی بەسرە و بەغدا، قەوارەیەك بوو، ئینگلیز دایتاشیبوو، بۆ پاراستنی بەرژەوەندییە ستراتیژیەکانی، بۆیە لکاندنی ویلایەتی موسڵ ( باشووری کوردستان ) بە دەوڵەتی نەتەوەیی عێراقەوە، شتێکی یەکجارەکی بوو لە سیاسەتی بەریتانیا. بە لەبەرچاوگرتنی هۆکاری ئابووری و بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا.

بە بڕیارێکی کۆمەڵەی نەتەوەکان لە ١٩٢٥/١/١٦ بە فەرمی باشووری کوردستان (ویلایەتی موسڵ)ی کردە بەشێك لە جەستەی سیاسی دەوڵەتی نەتەوەیی عێراق، بەڵام بەشێکی جیاواز، هەر بۆیە رژێمە عێراقییە یەك لەدوای یەکەکان، بەردەوام لە هەوڵی دارشتنەوەی پێکهاتەی نەتەوەیی و جوگراف و مێژویی ئەم هەرێمە بوون، بەدارشتنێکی عەرەبیانە لەپێناو نەهێشتنی هەموو مۆرکێکی جیاواز لەنێوان عێراقی عەرەبی و کوردستاندا. ئەم کارەشیان لەرێی سیاسەتی بەعەرەبکردن و راگواستنی دانیشتوانەوە بەئەنجام گەیاند.

### سنوری کوردستانی عێراق

دیاریکردنی سنووری باکوور و باکووری رۆژئاوا و رۆژهەڵاتی کوردستانی عێراق، کارێکی ئاسانە، چونکە رێك لەگەڵ سنووری نێودەوڵەتی، ئێران و تورکیا و سوریا رێکدەکەوێت، بەڵام ئەوەی سەختە باشوور و باشووری

ڕۆژئاوایــە، کــە بــەردەوام جێــی نــاکۆکی و ململانێــی کــورد وحکومەتــە عێراقییەکان بووە. بەشێکی زۆری مێژوو نووس و ئەکادیمی کورد و عـەرەب و بیـانیش پێـداگری دەکـەن کـە زنجـیرە گردۆڵکـەکانی حـەمرین/ مـەکحول دەکەوێتە باشوور و باشووری ڕۆژئاوا، کە سنوری نێوان هەرێمی کوردستان و بەشەکانی تـری عێـراق پێکدەهێنێت. بـە پشتبەسـتن بـە سـەرژمێری سـاڵی (١٩٥٧)، دانیشتوانی کورد بەم شێوەی خوارەوە پۆلێن دەکرێت:

١. پارێزگاکانی دهـۆك کـە (بەشـێك بـوو لـە موصـل) و هـەولێر و سـلێمانی و کەرکوك.

٢. سەرجەمی ناحیە و قـەزاکانی پارێزگـای موسـڵ جگـە لـە قـەزای موسـڵ و بەعاج و حەزەر.

٣.قـەزای خانـەقین و کفـری و دوزخورمـاتو و مەنـدەلی، جگـە لـە ناحیـەی (بەلەدروز ) لە پارێزگای دیالە.

٤. قەزای بەدرە لە پارێزگای واسیت. بڕوانە نەخشەی (١).

## بەعەرەبکردن و ڕاگواستن

دوای ساڵی (١٩٢٥) کە ویلایەتی موسڵ بە نەخشـەی سیاسـی عێراقـەوە لکێنرا، کورد لە زۆرینـەی نەتـەوەیی دەبێتـە کەمینـە بـە گـوێرەی دەوڵـەتی عێراقیـەوە. لـەو ڕۆژەوە کـورد وەك کەمینەیـەك بـەردەوام لـەژێر ڕەحمـی شـۆفینی و نەتەوەپەرسـتی ڕژێـم و دەسـەڵاتە جیاوازەکـان دابـووە، بـەپێی دروشمی: (گەلی عێراق بەشێکە لە نەتەوەی عەرەب و عێراقیش بەشـێکە لـە نیشتمانی عەرەبی). کورد بەشێك بووە لـە گـەلی عێـراق دوای سـاڵی ١٩٢٥، هەرگیز بەشێك نەبووە لە نەتەوەی عـەرەب. هـەرێمی کوردسـتان کـە ئێسـتا

بەشێکە لە خاکی عێراق، هەرگیز بەشێك نەبووە لە نیشتمانی عەرەبی. بە لکاندنی باشووری کوردستان (ویلایەتی موسڵ) بە عێراقەوە هەرێمێکی جوگرافی جیاواز دەبێتە بەشێك لە جەستەی سیاسی دەوڵەتی نەتەوەیی(قومي) عێراق. بەردەوام رژێمە نەتەوەپەرستە عێراقییەکان سەبارەت بە یەکێتی خاکی عێراق و ئاسایشی. نەتەوەیی و ئابووری، کوردیان کردۆتە مەترسی بۆ پارچە پارچە کردن، بۆیە رژێمە عێراقییەکان بە پاشایەتی و کۆنەپارێزیانەوە تا کۆماری و چەپ و پێشکەوتنخوازیان، لە هەوڵی دارشتنەوەی شێوەی نەتەوەیی و دیمۆگرافی و جوگرافیەکانی هەرێمی کوردستان بووینە، بە دارشتنەوەیەکی عەرەبیانەی نەخشە بۆدارێژراو، بۆ نەهێشتنی جیاوازییە ریشەییەکانی نێوان کوردستان و بەشەکانی تری عێراق لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە:

١. کوردستان ناوچەیەکی دەوڵەمەندە بەسامانی نەوت و کانزا.
٢. هەرێمێکی گرنگە بۆ دابینکردنی ئاسایشی خۆراکی.
٣. خاکەکەی بەپیتە و سەرچاوەی ئاوی زۆری هەیە.
٤. شوێنی ستراتیجی دەکەوێتە نێوان سنووری سێکوچکەی هەرسێ دەوڵەتی تورکیا و ئێران و سوریا.

سیاسەتی بەعەرەبکردن و راگواستن بە بەرنامەرێژی بوو، کە دەتوانین مێژووی ئەم وڵاتە بە مێژوویێکی ترسناك لە گۆڕینی هاوکێشەکان بە قازانجی زۆرینەی عەرەبی لە قەڵەم بدەین. بە گواستنەوەی دانیشتوانی کورد و نیشتەجێکردنی عەرەب لە جێگەیان، بەتایبەتی لەم سێ دەڤەرەدا:
(جەزیرە ، کەرکوك ، رۆژهەلاتی بەغدا(هەرێمی کوردە فەیلیەکان).




نەخشەی ژمارە (١) بەعەربكردن و راگواستنی دانیشتوانی كورد لە هەرێمی كوردستان*

---

* لە نەخشەكانی سەردار محمد عبدالرحمن / ئەتلەسی هەرێمی كوردستانی عێراق .

ئەم پرۆسەیە هاودەم بوو لەگەڵ کردە سەربازییەکان، کە هێز و سوپاکانی حکومەتی عێراق لە ناوچە کوردنشینەکان ئەنجامیان دەدا، بە وێرانکردن و روخاندن و راگواستنی دانیشتوانی گوندە کوردیەکان و کۆکردنەوەیان لە کۆمەڵگا زۆرەملێیەکاندا.

سەبارەت بەسیاسەتی یەکخستن و یەککردن لە ئەزمونی دەوڵەتی عێراقدا، بەتایبەتی لە تێڕوانینی رژێمی بەعسەوە دوایساڵی (١٩٦٨)، ئامانجی دوورکەوتنەوە بووە لە بیرۆکەی (عێراقی بوون) و نزیک بوونەوە بووە لە بیرۆکەی (بەعەرەبوون ـ العروبة).

**بەعەرەبوون:** بریتییە لە کرداری پێناسەکردنی سەرجەم دام و دەزگاکانی دەوڵەت و سیستەم و فەلسەفەی حوکمڕانی لە چوارچێوەی بیری نەتەوەپەرستی عەرەبیدا. بە واتایەکی تر ئەزمونی عێراقی بۆ گەشەپێدان و دروستکردن و چەسپاندن و پابەندبوونی عەرەبایەتی کاریکردووە، بە چەوساندنەوەی نەتەوەکانی تر. عێراقی بوون لە تێڕوانینی بەعسەوە تەنها یەك واتای هەیە، ئەویش بەعەرەبوونە. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە تایبەتمەندی حوکمی بەعس پەنابردن بووە بۆ توندوتیژی، وەك رێگە چارەیەك بۆ مەسەلەی فرە نەتەوەیی، بەسەر گەلانی عێراق بەگشتی و عەرەبە شیعەکانی باشوور و کوردەکانی باکوور بەتایبەتی رەنگیداوەتەوە.

ئەگەر سەرنج لە کرداری سیاسەتی بەعەرەبکردن بدەین، وەك رێگایەك بۆ سڕینەوەی شوناسی نەتەوەیی گەلی کورد، دەبینین بە دوو ئاراستەی هەزری کاریانکردووە. جۆرێکیان بریتی بووە لە گۆڕینی ناوی شوێنە کوردیەکان و دەرکردنی کورد لە زێدی باب و باپیرانیان و نیشتەجێکردنی

عـەرەب لـە جێگایانـدا. یـاخود كـاركردن بـۆ گـۆڕین و شـێواندنی مێـژووی نەتـەوەی كـورد و شـوێنەوارە دێرینـەكانی، كـە كوردبـوونی ناوچـەكە دەسەلمێنێت، بۆنمونە رژێمی بەعس كەوتە هەوڵی تێكدانی قـەڵای كـەركوك. رۆژی ١٩٩٩/١٠/٥ لـە سـیمنارێكی زانكـۆی تكریـت بـە ئامـادەبوونی كەسـی دووەمی رژێمی بەعس (عزت الدوری)، لـە بـەردەم كۆمـەڵێك ئەكادیمیسـتی و دیپلۆماتی عەرەب و بیانیدا، لە وتارێكیدا رایگەیاند **(پێویستە بـەووردی چـاو بە كتێبەكانی مێژوودا بكێڕین بۆ ئـەوەی راسـتیە مێژووییـەكان بدۆزینـەوە، سەلاحەدینی ئەیوبی پاڵەوانێكی عەرەبە نەك كورد)**. بێگومان سەرجەمی ئەم كـۆڕ و سـیمنارانە دەچـنە چوارچـێوەی قوتابخانـەی بابـەتی (المدرسـة الموضـوعیة)، بـۆ دیـاریكردنی شوناسـی نەتـەوەیی عـەرەبی، بـەڵام لـە نـەوەدەكانی سـەدەی رابـردوو (بیسـت)، حكومـەتی عێـراق رێگایـەكی تـری گرتەبەر بۆ گۆڕینی شوناسی نەتەوەیی كورد، ئەویش بە دابەشكردنی فۆرمی راستكردنەوەی باری نەتەوەیی (استمارة تصحیح القومیة). لـە هـەمان كاتـدا ویسـتویەتی رۆڵێكـی یاسـایی و ئارەزوومەندانـە بـدات بـە گـۆڕینی شوناسـی نەتـەوەیی. كـە بێگومـان فشـارێكی ئێجگـار زۆر هـەبووە بـۆ پڕكردنـەوەی فۆرمەكـە. سەرپێچـیكردن لـە پڕكردنـەوەی ئـەم فۆرمـە، بـریتی بـوو لـە بەندكردن، دواتر راگواستن بۆ ناوچەكانی ژێر دەسـەڵاتی حكومـەتی هـەرێمی كوردستان.

## قۆناغەكانی سیاسەتی بەعەرەبكردن و راگواستنی كورد:

قۆناغەكانی سیاسەتی بەعەرەبكردن و راگواستنی كورد، هەر لەسەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقەوە دەستیپێكردووە، كە بەم شێوەیە دەتوانین چەند قۆناغێكی جیاواز دەستنیشان بكەین، لە مێژووی دەستپێكردنی ئەم سیاسەتە، كە ئەمانەن:

١. قۆناغی لكاندنی ویلایەتی موسڵ بە عێراقەوە تاكو روخانی رژێمی پاشایەتی، لەنێوان ساڵانی (١٩٢٥ ـ ١٩٥٨).

٢. قۆناغی دامەزراندنی سیستەمی كۆماری تاكو روخانی حكومەتی عەبدولكەریم قاسم، (١٩٥٨ ـ ١٩٦٣).

٣. قۆناغی حوكمی حەرەس قەومییەكانی بەعس تاكو كودەتای جاری دووەمی بەعسیەكان، (١٩٦٣ ـ ١٩٦٨ ).

٤. قۆناغی چەسپاندنی دەسەڵاتی حیزبی بەعس تاكو هەڵگیرساندنی شەڕی خوێناوی، ئێران ـ عێراق)، لەنێوان ساڵانی (١٩٦٨ –١٩٨٠).

٥. قۆناغی پیادەكردنی جینۆسایدی كورد لەلایەن بەعسەوە تاكو راپەڕینە جەماوەرییەكەی كوردستان لە ساڵی ١٩٩١، لەنێوان ساڵانی (١٩٨٠ – ١٩٩١).

٦. قۆناغی دوای راپەڕین، لەنێوان ساڵانی (١٩٩١–٢٠٠٣) كە بەشێكی خاكی كوردستان لەژێر دەسەڵاتی رژێمی بەعس مابۆوە.

٧. قۆناغی دوای روخانی رژێمی بەعس لە ناوچە دابڕێنراوەكان، لە ساڵی (٢٠٠٣ تاكو ئێستا)، كە كێشەیەكی زۆری لەسەرە، لەنێوان كورد و دەسەڵاتی ناوەندی لە بەغدا لەلایەك، دانیشتوانی كوردو گروپە تیرۆرستەكان لە لایەكی تر، كە هەڕەشە لە گیان و سامانی هاوڵاتیانی كوردنشینی ناوچەكانی (سەعدیە و جەلەولا و قەرەتەپە و شەنگال و رۆژئاوای كەركوك دەكەن، بۆ بەزۆر دەرپەڕاندنیان لە شوێنەكانیان بۆ ناوچەكانی ژێر دەسەڵاتی حكومەتی هەرێمی كوردستان.

## قۆناغی یەکەم: (١٩٢٥ - ١٩٥٨)

ئەم قۆناغە هەموو سەردەمی پاشایەتی دەگرێتەوە، بەتایبەتی لەو کاتەی کە ویلایەتی موسڵ بە عێراقەوە لکێنرا، بە رۆژگارێکی نائارام دادەنرێت، کە سیستەمی حوکمڕانی و باری ئاسایشی گشتی و ئیداری عێراق لە قۆناغەکانی سەرەتایی بوو پلان و بەرنامەی کاری نەبوو بەڵام کرداری بەعەربکردن و ڕاگواستنی کورد وەك پێویستیەکی رەگەزپەرستی و لەسەرخۆ بوو بەڵام بە پێی بەرنامە و پلانی دارێژراو. لە رووی جوگرافیش رووبەرێکی کەمی گرتۆتەوە. هەروەها لەم قۆناغە گەورەترین شالاوی ڕاگواستنی کوردە فەیلییەکان بەڕێوەچوو لە دووای دەرچوونی یاسای رەگەزنامەی عێراقی(قانون الجنسية العراقية) کە بە رەچەڵەکی ئێرانیان دادەنان. ساڵی ١٩٣٢ لە چوارچێوەی سیاسەتی ناڕاستەوخۆی بەعەربکردن بڕیاری ژمارە (٥٠)ی تایبەت بە رێکخستنی مافی زەوی و زار دەرکرا. کە ساڵی ١٩٣٨ گۆڕدرا بە یاسای ژمارە (٢٩). لەم یاسایە مافی خاوەنداریەتی بەڕەسمی درا بەو هۆز و بنەماڵانەی نیشتەجێی ئەو زەویانەن کە لەسەری دەژین. بەپێی ئەم یاسایە خاوەنداریەتی و تاپۆکردنی زەویە کشتوکاڵیەکانی کوردی گرتەوە، کە چەندین هۆز و عەشیرەتی کۆچەری عەرەب لە ناوچە کوردیەکان نیشتەجێکران، بەتایبەتی لە ناوچەکانی خواروی رۆژئاوای کەرکوك و دەشتی قەراج و کەندیناوە و گوێڕو زەممار. بەپێی راپۆرتێکی وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی عێراق لە رۆژی (١٩٥٨/٥/١١) دەرچووە، دەرکەوتووە لەنێوان ساڵانی (١٩٤٧-١٩٥٧)، لیوای کەرکوك (٢٨٠٠٠)کەس و لیوای موسل (١٧٠٠٠)کەسی بۆ رەوانەکراوە، کە زۆربەیان پێدەچێت لە لیوای عەممارەوە هاتبن.

پـرۆژەی حەویجـە کـە لەسـاڵی (١٩٣٦)دەسـتپێکرد و (١٩٤٠) تـەواوبوو. بەتەواوبوونی ئەم پرۆژەیـە چـەندان هـەزار ماڵـە عـەرەبی کۆچـەری هێنرانـە ناوچـەکە، بـەپانتایی ئـەو زەویانـەی لـە پرۆژەکـە سـوودی لێبینیـوە بـۆ نیشتەجێکردن. ژمارەی ئەو عەرەبانەی لەم ناوچەیەدا نیشتەجێکران، بەپێی ئاماری ١٩٥٧ گەیشتۆتە (٢٧٧٠٥) کەس، لە (٢٢٨) گوندی نوێدا. بەهـەمان شێوە سـاڵی ١٩٥١ لـە پـرۆژەی مـەخمور لـە (٥٠ – ١٠٠ دۆنم) زەوی بەسـەر (٧٠) خێزانی عەرەبدا دابەشکرد.

نیشتەجێکردنی هۆز و خێڵە کۆچەرییە عەرەبییەکان لە ناوچە کوردییەکانـدا، بەزۆری ئەو ناوچانەی گرتووتەوە کـە سنووری بەیـەك گەیشـتن پێکدەهێنن لەنێوان کوردستان و ویلایەتی بەغدا، بەرەو قوڵایی خاکی کوردستان، هەر لە خانەقین و مەندەلی یەوە بۆ دووز و خوارووی کەرکوك و خوارووی مەخمور تا دەگاتـە شـەنگال، لـە ناوچـەی شـەنگال هـەر لـە سـاڵانی پـێش دامەزرانـدنی دەوڵەتی عێراق هـەزاران رەوەنـدی هـۆزی کۆچـەری(شـەمەر و عبیـد و طـي) نیشتەجێکران، ئەم پرۆسەیە لـە دوای دامەزرانـدنی دەوڵـەتی عێـراقیش هـەر بەردەوام بوو.

بێگومان نیشتەجێکردنی هۆز و خێڵە عەرەبییـەکان لـە ناوچـە کوردییەکانـدا بـاری دیمـۆگرافی دانیشـتوانی لـە رووی پێکهاتـەی نەتـەوەیی بەشـێوەیەکی بەرچاو گۆڕیوە. جگە لەمانە بەهۆی دامەزراندنی پیشەسازییە پەترۆلیـەکانی کۆمپانیای نـەوتی عێـراق، لـە شـاری کـەرکوك چـەندین گـۆڕانی دیمـۆگرافی و نەتـەوەیی بەسـەر ناوچـەکە داهێنـا. چـونکە کۆمپانیاکـە ژمارەیـەکی زۆری کرێکـاری عـەرەبی لـە پارێزگاکـانی دیکـەوە هێنایـە پارێزگـای کـەرکوك و نیشتەجێکران. چەندەها گەڕەکی نوێ لـە شـاری کـەرکوك دروسـتکران، وەك گەڕەکی (عەرەفە) (کرکوك الجدیدة).

## قۆناغی دووەم:(١٩٥٨ ـ ١٩٦٣)

ئـەم قۆناغـە لـەو کاتـەوە دەسـتپێدەکات، کـە رژێمـی پاشـایەتی لـە ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ هەرەسی هێناو بۆ یەکەمجار سیسـتەمی کۆمـاری لـە عێـراق راگەیانـدرا. هەرچـەندە ئـەم شۆڕشـە لـە سـەرەتادا زۆربـەی گـەلانی عێـراق پشتگیریان لێکرد. هەڵوێستی عەبدولکەریم قاسم بەرامبەر کورد ئەرێنی بـوو، بانگهێشتی سەرکردە کوردە دوورخراوەکانی کـردەوە بـۆ عێـراق، بەتایبـەتی بارزانی. لە (١٩٥٨/١٠/٦)، مسـتەفا بـارزانی لەلایـەن عەبدولکـەریم قاسـم بـە گەرمی پێشوازی لێکرا، لەبەرامبەردا مستەفا بارزانی تـەواوی توانـای خـۆی و پارتەکەی بۆ شۆڕشی (١٤ی تـەمووز) دەربڕی. بەتایبەتی کە دەستوری کاتی کۆماری عێراق، لە مادەی سێیەمدا ئاماژە بەوە دەکات، کورد و عەرەب، لەو نیشتمانەی ناوی عێراقە هاوبەشـن. بـەلأم رۆژگارەکـانی دواتـر دەریانخسـت، هەڵوێستی نەگۆڕی رژێمی سیاسی عێراق لەبەرامبەر کێشەی کـورد هـەر ئـەو سیاسەتەیە کە پێشتر لە رێگای بەعەرەبکردن و راگواستنی دانیشتوانی کورد پەیڕەو دەکرا.

لەدوای سەرکەوتنی شۆڕش بـە ماوەیـەکی کـورت (زعـیم نـازم تـەبەقچـەلی)، وەك سەرکردەی فیرقەی دووی سوپای عێراق دیارکرا، بارەگاکەی لە کەرکوك بوو، کە سەرپـەرشتی هێزی سوپای عێراق لـە بـاکوور دەکـرد. لـەم ماوەیـەدا رۆڵێکـی بەرچـاوی بـینی لـە بەعـەربکردنی ناوچـە کوردییـەکان، بەتایبـەتی لەشاری کەرکوك. سەبارەت بە مادەی سێی دەستوری کاتی عێـراق، کـە دان بە مافی کوردەکان دادەنێ، بەتـەواوەتی فەرامۆش کرا. ئەمە سەرەڕای ئەوەی هەر برگەی دووەم لە هەمان دەستور بە تـەواوەتی دژی مادەی سـێیەمە، کـە

دەڵێت: (عێراق بەشێکە لە نەتەوەی عەرەب). لەدرێژە پێدانی سیاسەتی بەعەرەبکردنی ناوچە کوردییەکان، دەسەڵاتدارانی عێراق دەستیانکرد بە دابەشکردنی زەوی بەسەر عەشیرەتە کۆچەریە عەرەبەکان، بەتایبەتی نیشتەجێکردنی ژمارەیەکی زۆر لە خێڵە کۆچەرییە عەربەکانی ناوچەی جەزیرە. لە ساڵی ( ١٩٦٠) ناحیەی رەبیعە دروستکرا و (١٦) ئاوایی بۆ عەرەبەکان کرایەوە. لە تەلەعفر (١٢)و لە شەنگال (١٥)، لە ناحیەی عەتبە(٨) ئاوایی بۆ عەرەبەکان کرایەوە. جێی ئاماژە پێدانە هەر لەم قۆناغەدا چەند گۆڕانکارییەکی کارگێڕی بەسەر چەند ناوچەیەکی زۆرینەی کورد هێنرا، کە بەمەبەستی شێواندنی دیمۆگرافیای شارە کوردییەکان بوو. لەساڵی (١٩٦٢) قەزای حەویجە پێکهێنرا، لە رووی هاوکێشەی دیمۆگرافییەوە (١٧٪)ی دانیشتوانی پارێزگای کەرکوك پێکدەهێنێت. کە زۆربەی دانیشتوانی قەزاکە خێڵە عەرەبیەکان بوون، کە پێشتر لەو ناوچەیە نیشتەجێکرابوون.

## قۆناغی سێیەم: ( ١٩٦٣- ١٩٦٨)

ئەم قۆناغە لەدوای کودەتاکەی حەرەس قەومیەکان دێت کە بەسەرکردایەتی (عەبدولسەلام محەمەد عارف) لە (٨)ی شوباتی١٩٦٣ لە دژی عەبدولکەریم قاسم ئەنجامدرا. ئەم دەسەڵاتە هەر لە سەرەتای دەست بەسەر داگرتنی دەسەڵات، هیچ پرۆژەیەکی ئەرێنانەی پێنەبوو، بۆ چارەسەرکردنی ئاشتیانەی کێشەی کورد لە عێراق. لەم سەردەمەدا عەبدولسەلام محەمەد عارف کەوتە پەیڕەوکردنی سیاسەتی یەکێتی عەرەبی

(الوحدة العربية) كە هەڵقوڵاوی بیروبۆچونی رەگەزپەرستی نەتەوەیی بوو، بە پێکهێنــانی حیزبێکــی نــوێ هــەموو عێــراق بگرێتــەوە بــەناوی یــەکێتی سۆسیالیسـتی عـەرەبی (الاتحـاد العربـي الاشـتراكي). لـە هـەمووی سـەیرتر بانگەشەی ( پارتی دیموکراتی کوردسـتان)ی کـرد، کـە لـە چواچێوەی ئـەم پارتە نوێیەدا خۆی بتوێنێتەوە.

لەم قۆناغەدا پرسێکی سیاسـی زۆر گـرنگ هاتـە ئـاراوە، کـە پەیوەنـدی بـە پرۆسەی بەعەرەبکردنەوە هەبوو، ئەویش دەوڵەتی یـەکگرتوی عـەرەبی بـوو (الجمهوریـة العربیـة المتحـدة)، هــەر سـێ وڵاتـی میسـر و سـوریا و عێراقـی دەگرتەوە. دەسەڵاتدارانی عێراق وایان دەڕوانیە کورد وەك کۆسپی سەرەکی بەردەم ئەم یەکگرتنە. کوردیش لەلای خۆیەوە ئەم پرۆژەی بە مەترسییەکی گــەورە بـۆ سـەر شوناسـی نەتــەوەیی خـۆی دەزانـی، چـونکە لــەکاتی دروسـتکردنی ئـەم دەوڵەتـە رەگەزنامـەکان (الجنسیات) لـە هەرسـێ وڵاتـدا دەگۆڕدرا، بۆ رەگەزنامەی عەرەبی. بۆنمونە هاووڵاتی عێراقـی، کـە هـەڵگری رەگەزنامەی عێراقییە، ئەو کات دەبوایە بگۆڕدرێت بۆ رەگەزنامـەی عـەرەبی نە لەدوور نە لەنزیك هیچ تایبەتمەندیەکی گەلی کوردیان بەهەنـد وەرنـەگرت، چ لەرووی جیاوازی نەتەوەیی یا جوگرافییەوە. لە ئایاری ( ١٩٦٣ ) گفتوگۆی نێوان کورد و حکومەتی عێراقی گەیشتە بنبەست. هەر لە حوزەیرانی هـەمان سـاڵدا، هێرشـی سـەربازی حکومـەت بۆسـەر شـار و گونـدەکانی کوردسـتان دەستیپێکرد. بۆ نمونە لـە شـاری سلێمانی قەسابخانەیەکیان ئەنجامـدا کـە ( ٢٨٠) دووسەدو هەشتا کەسی مەدەنی بێتاوانیان گوللەباران کـرد. لـە (٩ی تەمووزی ١٩٦٣) لە شاری کۆیە (٢٠) بیست کـەس، پـاش بەستانەوەیان بـە ستوونی سەرشەقامەکان گوللـەباران کـران. حکومـەت لـەو سـەردەمە کەوتـە

پەیڕەوکردنی جینۆسایدکردنی گەلی کورد، بە دەرکردن و ڕاگوێزانی گوندە کوردییەکان و نیشتەجێکردنی ژمارەیەکی زۆری خێڵە کۆچەرییە عەرەبەکان لە جێگایاندا، بەتایبەتی لە پارێزگای کەرکوك و هەولێر. بۆنمونە تەنیا لە پارێزگای هەولێر (٢٧) گوند بە زۆرەملێ چۆلکران، بە پاساوی پاراستنی بیرە نەوتەکانی ناوچەکە و نیشتەجێکردنی عەرەب لەجێگایان و پڕ چەك کردنیان و هاوکاری کردنی داراییان.

**ڕژێمی عێراق بۆ پەیڕەوکردنی سیاسەتی بەعەرەبکردن و ڕاگواستن دەستیکرد بە:**

١. وێرانکردنی ئەو گوندانەی کە نزیك شاری کەرکوك بوون، بەتایبەتی ئەوانەی نزیك بیرە نەوتەکان، کە (١٣) گوند بوو، وەك (سۆنەگولی، یاروەلی، پەنجاعەلی، وەلی پاشا، قزل قایە، چیمەنی گەورە و چیمەنی بچوك، جەوەڵ بۆر، هەنجیرە، قوتان، قوشقانە، شۆڕاو و یاجوان).

٢. ڕاگواستنی هەموو کوردەکانی ناحیەی دوبز، پاشان ناوەکەی گۆڕدرا بۆ (دبس) و هێنانی عەشیرەتی کۆچەری عەرەبی (حدیدی) و نیشتەجێکردنیان، لە گوندەکانی(قەرەدەرە، عەمشە، مەرعی، قەلاعەربەت، کتکە...هتد).

٣. دەرکردنی کرێکارە کوردەکان لە کۆمپانیای نەوتی کەرکوك.

٤. گۆڕینی ناوی ناوەندەکانی خوێندن و شوێنە گشتییەکان لە کوردییەوە بۆ عەرەبی.

دەڤەری شەنگالیش لەم تاوانە بێبەش نەبوو، لەساڵی ١٩٦٤ ڕووبەڕووی شاڵاوێکی دڕاندانەی توندی بەعەرەبکردن و ڕاگواستنەوە بوو. بۆ نمونە (١٣٢) گوندی دەڤەرەکە بەر ئەم شاڵاوەی ڕاگوێزان کەوتن و دانیشتوانەکەی لە (١١) ئۆردوگای زۆرەملێ کۆکرانەوە، کە بەناوی زەقی عەرەبی ناونران، لەوانە (الاندلس، القحطانیة، العروبة، القادسیة، حطین، الولید، العدنانیة...هتد).

## قۆناغی چوارەم: (١٩٦٨ - ١٩٨٠)

ئەم قۆناغە بە توندترین وشۆفینیترین قۆناغی بزوتنەوەی نەتەوەپەرستی عەرەبی دادەنرێت، کە دەسەڵاتدارانی عێراق پێیان وابوو کێشەی کورد بە بنبڕکردنی کورد چارەسەر دەبێت، بۆیە سیاسەتی بەعەرەبکردن و ڕاگواستن، لە مێژووی سیاسی عێراق دەچێتە قۆناغێکی جیاوازەوە. تا ئەندازەیەکی زۆر شێوازی بەعسیەکان لە جۆری ڕەفتارکردن لەگەڵ گەلە ژێر دەستەکانیاندا، لە تاکتیك و ڕێوشوێنی نازییەکان دەچوو. بۆنمونە لە مادەی حەوت، کە لە کۆنگرەی دامەزراندنی یەکەمی حیزبی بەعس پەسەندکراوە، (کوردستانی بە بەشێك لە نیشتمانی عەرەبی داناوە). ئەم قۆناغەی حیزبی بەعس بە دڕندانەتر لە قۆناغەکانی پێشتر دادەنرێت، لە کوشتن و سوتاندن و وێرانکردنی گوندەکانی کوردستا، بۆنمونە لە ( ١٩ی ئابی ساڵی ١٩٦٩) هێرشی سوپای عێراق بۆ سەر هەردوو گوندی (**دەکا**) و(**خورت**)، کە دەکەونە باکووری ڕۆژهەڵاتی شاری موسڵ لە ناوچەی ئاکرێ، بووە هۆی سوتاندنی هەردوو گوندەکەو ئاگرتێبەردانی (٦٧) شەست حەوت ژن و منداڵ و پیر، کە



گوللەبارانکردنی (٦٠) کەس لە دانیشتوانی گوندی (صوریا)

لە ئەشکەوتێکی نزیك گوندەکە خۆیان حەشار دابوو. لە (١٦-٩-١٩٦٩) هێرش بۆ سەر گوندی (**صوریا**) لە سێگۆشەی سنووری عێراق وتورکیا و سوریا، ( ٦٠) کەس لە دانیشتوانە سڤیلەکەی گوللەباران کران.

هەرچەندە مانگی ئاداری ١٩٧٠ رێکەوتننامەی ئادار لە نێوان بزوتنەوەی کورد و حکومەتی عێراق مۆرکرا، کە دانپێدان بوو بە مافی ئۆتۆنۆمی گەلی کورد لە هەرێمی کوردستان. بەلاّم بەر لە راگەیاندنی یاسای ئۆتۆنۆمی ژمارە (٣) سالّی ١٩٧٤، حکومەت دەستیکرد بە جێبەجێکردنی بە پەلەی سیاسەتی بەعەرەبکردن و راگواستنی دانیشتوانی ناوچەکانی کەرکوك و خانەقین و زمار و شەنگال و شێخان. لە سالّی (١٩٧١ - ١٩٧٢) زیاتر لە (٤٠٠٠) چل هەزار کوردی فەیلی ناسنامەی هاوولاّتی بوونی عێراقییان

لێسـەندرایەوە و رەوانـەی سـنورەکانی ئێـران کـران. ئـەم ژمارەیـەی کـوردە دەرکراوەکان تا کۆتایی ساڵی (١٩٨٠) گەیشـتە نزیکـەی (٢١٥٠٠٠) دووسـەدو پـازدە هـەزار کـەس. بـەپێی ئامارەکـانی خاچـی سـوور و مـانگی سـووری نێودەوڵەتی بـە (٤٠٠٠٠) چوارسـەد هـەزار هـاووڵاتی مەزەنـدە دەکرێـت. لـە سـاڵی (١٩٧٣) هەڵمـەتی گـرتن و راوەدوونـانی کـوردی ئێزیـدی لـە دەڤـەری شەنگال دەستپێکرد، بۆئـەوەی ناچـاریان بکـەن زێـدی خۆیـان چۆڵبکەن و بەرەو ناوچە کوردنشینەکانی تر کۆچ بکـەن. بـە بـەردەوامبوون لەسـەر ئـەم سیاسەتە ناوچەکانی ئاکرێ و شێخانیشی گرتەوە، هەروەها حکومەتی عێراق هەر بەوەشەوە نەوەستا لـە رێکـەوتی ( ٢٤/ ٤/١٩٧٤ ) هێرشـێکی ئاسمـانی درندانەی کردە سەر شاری قەڵادزێ، کە بووە هۆی گیان لەدەستدانی( ١٦٣) سەدو شەست و سێ کەس و برینـدارکردنی (٢٥٠) دووسـەدوپەنجا هـاووڵاتی، کـە ژمارەیـەکی زۆری خوێنـدکاری زانکـۆی سـلێمانی تێـدابوو، زانکۆکەشـی بەتەواوی خاپوورو وێرانکرد، هەر لەم ماوەیەدا لـە سـنووری شـاری کـەرکوك چـەندین گـەرەکی نـوێ بـۆ نیشـتەجێکردنی خێزانـە عەرەبـە هاوردەکـان دروسـتکران. لـەماوەی چـەند سـاڵێك، (١٩) نـۆزدە گـەڕەکی عەرەبنشـین دروسـتکران. جێـی باسـە هـەر لـە چوارچـیوەی بەعـەرەبکردنی ناوچـە کوردییـەکان، بـەعس هەڵمـەتێکی بـەرفرەوانی نـاوگۆڕینی شـار و شارۆچـکە کوردیـەکانی دەسـتپێکرد، وەك نمونـە: قرەهـەنجیر: (الربیـع)، سـەرگەڕان: (القدس) ...هتد.



دەرکردنی کورد لە زێدی باب و باپیرانیان

دوای ڕێکەوتننامەی جەزائیر ساڵی (١٩٧٥) و هەرەسهێنانی شۆڕشی ئەیلول، دەستی حکومەتی عێراق کراوەبوو، بۆ جێبەجێکردنی زیاتری سیاسەتی بەعەرەبکردن و ڕاگواستنی کورد، بەڵام ئەمجارەیان بەپێی نەخشەیەکی پلان بۆدارێژراو ئەنجامدرا، نەک لەو ناوچانەی کە فرە نەتەوەبوون، بەڵکو ئەمجارەیان ناوچە زۆرینە کوردییەکانیشی گرتەوە. بە ڕاگوێزرانیان بۆ کۆمەڵێك شوێنی دیاریکراو، کە بەعسیەکان ناویان نابوو (گوندی هاوچەرخ)، کەچی لە ڕاستیدا ئۆردوگای زۆرەملێ بوون. بێجگە لەم ژمارە زۆرەی هاووڵاتیانی کورد، کە بۆ ناوچەکانی باشووری عێراق، بەتایبەتی هەردوو شاری (ناسریە و دیوانیە)، ساڵی (١٩٧٥) زیاتر لە (٢٠٠٠٠٠) دووسەد هەزار کورد لە کوردستانەوە بەرەو ناوچەکانی باشووری عێراق ڕاگوێزران. لە مانگی یازدەی ١٩٧٥ کۆمەڵەی گەلانی هەڕەشەلێکراو لە ئەڵمانیا ـ گویتنگن، لەگەڵ کۆمەڵەی مافی مرۆڤ لە هۆلەندا، ڕایانگەیاند ژمارەی ڕاگوێزراوان

گەیشتۆتە (٢٠٠٠٠) دووسەد هەزار کەس و (١١٦) سەد و شازدە گوند وێرانکران. (٢٥٠٠٠) بیست و پێنج هەزار کوردی ئێزیدیش لە شەنگال راگوێزران. ئەم شاڵاوی راگواستنە بەردەوام دەبێت، بە جۆرێك تا سەرەتای ساڵی ١٩٧٩ ژمارەی کوردە راگوێزراوەکان دەگاتە (٧٠٠٠٠٠)حەوت سەد هەزار کەس، کە لە (١٢٢٢) هەزارو دووسەد و بیست ودوو گوند شاڵاوەکە ئەنجامدرا.

**شێوازەکانی راگواستنی کورد لە دوای رێکەوتننامەی جەزائیر بەم شێوەیە بوو:**

١. راگواستنی دانیشتوانی ئەو ناوچانەی بە شوێنی ستراتیژی بەرگریکردنی عێراق دادەنرا.
٢. راگواستنی ناوچە نەوتییەکان.
٣. راگواستنی ناوچە سنوورییەکان.

**یەکەم: راگواستنی دانیشتوانی ناوچە ستراتیژیە بەرگریکردنەکانی عێراق.**

ئەو ناوچە و رێگا و بانانە کە سوپای دەوڵەتی عێراق لە هێرشی سەربازیدا بۆ گرتنی ئامانجێکی ستراتیژی دەیگرێتە بەر، وەکو گوندەکانی ( قەزای خانەقین و مەندەلی لە پارێزگای دیالە)، (قەزای بەدرە لە واسیت ) و قەزاکانی شێخان و تەلکێف و تەلەعفەر و شەنگال، لە پارێزگای موسڵ و بەشێك لە قەزای زاخۆ و سمێل لە پارێزگای دهۆك و بەشێك لە قەزای دوز لە پارێزگای کەرکوك.

**دووەم: راگواستنی ناوچە نەوتییەکان.**

ئاشکرایە کە نەوت مادەیەکی ستراتیژییە و گرنگی جیۆپۆلەتیکی هەیە لە ئابووری دەوڵەتاندا. کوردستانیش زامنی بوونی برێکی زۆری خاوی نەوتی

مسۆگەر کردوە، بۆیە شالاوی بەعەرەبکردن و راگواستن بە زۆری دانیشتوانی ئەم ناوچانەی گرتەوە کە بە نەوت دەوڵەمەندن. ناوچەکانیش ئەمانەن:

١. ناوەندی قەزای کەرکوك و قەزای دوبز لە پارێزگای کەرکوك.
٢. قەزای کۆیە لە پارێزگای هەولێر.

## سێیەم: راگواستنی ناوچە سنوورییەکان.

بەپێی رێکەوتننامەی جەزائیری ساڵی ١٩٧٥، کە دەرفەتێکی باش بوو بۆ دەسەلاَتدارانی بەعس، تا نەخشە و پلانەکانیان لە کوردستان جێبەجێبکەن، هەر بۆیە بە پەلە کەوتنە راگواستنی دانیشتوانی ناوچە سنوورییەکانی (عێراق ـ ئێران) و (عێراق ـ تورکیا) و (عێراق ـ سوریا )، بە قولآیی (١٠ ـ ٢٠ کم)، بەناوی پشتێنەی ئەمنییەوە، بۆ ئۆردوگا زۆرەملێیەکان. لەنێوان سالآنی (١٩٧٥ ـ ١٩٧٨) دەیان هەزار خێزانی کورد لە ئۆردوگاکان کۆکرانەوە و هەموو گوند و لادێکانی سەر سنوور لەگەڵ خاك تەخت کران، ناوچەکانیش ئەمانە بوون:

١. قەزاکانی چۆمان، رەواندوز، مێرگەسۆر لە پارێزگای هەولێر.
٢. هەردوو قەزای ئامێدی، زاخۆ لە پارێزگای دهۆك.
٣. قەزاکانی قەلآدزێ، رانیە، شاربازێر، شارەزوور و سەرجەم گوندە سنوورییەکانی نێوان عێراق و ئێران لە پارێزگای سلێمانی.

هەر لە چوارچێوەی سیاسەتی بەعەرەبکردن، حکومەتی بەعس ناوی پارێزگای کەرکوکی گۆری بۆ پارێزگای (التأميم) و دووبارە نەخشەی ئیداری پارێزگاکەی دارشتەوە. بەپێی نوسراوی سەرۆکایەتی کۆمار ژمارە (٤١) لە ١٩٧٦/١/٢٩ هەر چوار قەزای چەمچەماڵ، کەلار، کفری، توزخورماتوو و لە پارێزگاکە داماڵدران و لکێنران بە پارێزگاکانی سلێمانی و دیالە و سەلاحەدین بە ریزبەندی. ئامانج کەمکردنەوەی رێژەی کورد بوو لە پارێزگای کەرکوك.

## قۆناغی پێنجەم: ( ١٩٨٠ – ١٩٩١)

حیزبی بەعس لەم قۆناغەدا توانایەکی زۆری لۆژیستی، ئابووری و ستراتیژی تەرخانکرد، بۆ فراوانکردنی سیاسەتی بەعەرەبکردن و راگواستن و سڕینەوەی شوناسی کوردی لە ناوچە کوردییەکان. لە نیوەی دووەمی ئەم قۆناغە دەچێتە مەترسیدارترین رەوشیەوە، کە تێیدا نوێترین تەکنیك و شێوازی سەربازی و چڕترین پلان بەکار دەهێنرێت، بۆ هەڵتەکاندن و سڕینەوەی بوونی کورد لە کوردستان. قۆناغی بەعەرەبکردن و راگواستنی گۆڕی، لەشێوازە کۆنەکەیەوە بۆ شێوازێکی نوێ، ئەویش قۆناغی (جینۆساید) بوو. لەم قۆناغەدا ترسناکترین و نوێترین تەکنۆلۆژیای سەربازی قەدەغەکراو بەکارهێنرا بۆ قڕکردنی کورد، کە ئەویش بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی بوو، بۆ لێدانی شاری هەڵەبجە لە ساڵی (١٩٨٨).

لە ئەیلولی (١٩٨٠) جەنگی خوێناوی (ئێران - عێراق) هەڵگیرسا. ژمارەیەکی یەکجار زۆر لە هەردوو لا بوونە سوتەمەنی ئەم شەڕە خوێناوییە و هەردوو وڵات توشی زیانی مادی گەورە بوون. لەمیانەی ئەم جەنگەدا کرداری بەعەرەبکردن و راگواستنی دانیشتوان بە گوڕتر بوو، بەشێوەیەکی فراوان ئەم ناوچانەی گرتەوە:

١. لە پارێزگای سلێمانی (قەزای پێنجوێن و شارۆچکەی بیارە و شارۆچکەی سیوەیل و ئۆردوگای ناڵپارێز و گوندەکانی دەوروبەریان).

٢. لە پارێزگای هەولێر (قەزای چۆمان و گوند و شارۆچکەکانی).

له پاش ئەوەی رژێمی عێراق هەموو ناوچە سنورییەکانی بە درێژایی سنوری عێراق ـ ئێران، عێراق ـ تورکیا، عێراق ـ سوریا بە بیانۆی پشتێنەی ئەمنییەوە چۆلکرد و راگوێزران، راگواستن تا دەهات فراوان دەبوو بە جۆرێك لە هەشتاکاندا بە قولایی (٤٠ کم)، ناوچە کوردییەکان راگوێزران و دانیشتوانەکانیان لە کۆمەڵێك ئۆردوگای زۆرەملێ کۆکرانەوە، لە دوای ئەمە تاوانە گەورەکەی ئەنفال دەستپێکرد.

هەر لەمیانەی جەنگی هەشت ساڵەی (عێراق - ئێران)، کرداری راگواستن و پاکتاوکردنی کوردە فەیلییەکان لە بەغدا و رۆژهەلاتی بەغدا دەستی پێکردەوە، نزیکەی نیو ملیۆن کوردی فەیلی بۆ سەر سنورەکانی عێراق - ئێران گواسترانەوە، بەبیانۆی ئەوەی کە ئێرانین (التبعیة الایرانیة).

لە ساڵی (١٩٨٣) لە تۆڵەی ئەو شکستە سەربازییەی کە رژێم لە بەرەکانی جەنگ لەسەر دەستی سوپای ئێران بەسەری هاتبوو لە بەرەی جەنگی حاجی ئۆمەران، کە بووە هۆی لە دەستدانی ئەم ناچەیە، بۆیە هەڵسا بە رەشبگیرکردنی بارزانییەکان، لە ئۆردوگاکانی قوشتەپە، بەحرکە، حەریر و دیانە. ژمارەی ئەو بارزانیانەی بەر ئەم شاڵاوە کەوتن نزیکەی هەشت هەزار کەس دەبوون، هەموویان نێرینە و تەمەنیان لە (١٥)ساڵ و بەرەو سەرەوە بوو. صدام حسین دەربارەی چارەنوسی بارزانییەکان هیچ گومان لە زیندومانەوەیان ناهێلێت، کە گوتی: (**ئەوانە خیانەتیان لە پەیمان کرد، بۆیە ئێمەش بەسزای توندو سەختمان گەیاندن و بۆ دۆزەخمان ناردن**).

## تایبه‌تمه‌ندیی په‌لامارەکانی نێوان ساڵانی ( ١٩٨٧ -١٩٨٩ ) بۆ سەر ناوچە کوردنشینەکان لەلایەن سوپای بەعسەوە:

١. کوشتن و لەناوبردنی بە کۆمەڵ و بێسەروشوێنکردنی دەیان هەزار کەسی مەدەنی، کە ژمارەیەکی زۆری ژن و منداڵ و پیر و هەندێ جار تەواوی دانیشتوانی چەند گوندێك پێکەوە بووە.

٢. بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی دژ بە شاری هەڵەبجە و دەیان گوندی کوردنشین.

٣. وێرانکردنی هەزاران گوند، کە لە بەڵگەنامەکانی حکومەتدا ناویان هاتووە، (سوتاوە، تێکدراوە، تەختکراوە).

٤. وێرانکردنی مزگەوت و قوتابخانە و نەخۆشخانە و کانی و سەرچاوەکانی ئاو و هەرچی دەزگاکانی گشتی بوون لەم ناوچانەدا.

٥. تاڵانکردنی سەروەت و سامانی هاووڵاتیانی کورد لەلایەن سوپاو جاشە کوردەکانی سەر بە حکومەت.

٦. دەستبەسەرکردن و بەندکردنی هەزاران ئافرەت و منداڵ و پیر، بۆ چەند مانگ لە بارودۆخێکی ئێجگار سەخت بەبیانوی نەیاریکردنیان بۆ حکومەت، ژمارەیەکی زۆریشیان، بەهۆی بەدخۆراکی و نەخۆشیەوە، لە گرتوخانەکان گیانیان لە دەستدا.

٧. گواستنەوەی سەدان هەزار لە دانیشتوانی گوندەکان، لەدوای وێرانکردنی گوندەکانیان، بۆ ناوچەکانی تر، دوور لە زێد و شوێنی خۆیان.

## تێکدانی بنەما و ژێرخانی ئابووریی دێهاتی کوردستان:

لە (٢٩ /٣/١٩٨٧) بە بڕیارێکی سەرکردایەتی، حوکمی ڕەها درا بە ( عەلی حەسەن ئەلمەجید)، ئەلمەجید دوای وەرگرتنی ئەم دەسەلاتە، کەوتە پیادەکردنی سیاسەتێکی ترسناك و داپلۆسین و لەناوبردنی فراوان دژ بە تەواوی دێهاتنشینەکانی کورد، بەفەرمانێك لە حوزەیرانی ١٩٨٧، هەموو ناوچە گوندنشینەکان کران بە ناوچەی قەدەغەکراو فەرماندرا بەوەی هەرکەسێك لەم ناوچانەدا دەستگیربکرێت بەبێ لێپرسینەوە، ئەوانەی تەمەنیان لەنێوان (١٥-٧٠) ساڵدایە لە سێدارە بدرێن. بۆیە لە ترسی چەسپاندنی سزاکانی ئەم بڕیارە خەڵکێکی زۆر گوندەکانیان چۆڵکرد و بەرەو شار و شارۆچکەکان کۆچیانکرد.

## قۆناغی شەشەم: ( ١٩٩١ - ٢٠٠٣)

ئەم قۆناغە لەدوای داگیرکردنی کوێت لەلایەن رژێمی بەعسەوە دەستپێدەکات. هاوکێشە هەرێمی و نێودەوڵەتیەکان بەرامبەر عێراق گۆڕان و جیهان کەوتە دۆخێکی تایبەتمەندەوە. لە رۆژی (١٩٩١/١/١٧) هاوپەیمانان لە ئۆپەراسۆنێکی سەربازیدا بەناوی گەردەلوولی بیابان، گورزێکی کوشندەیان لە رژێمی عێراق وەشاند. عێراق بەشکستێکی گەورە لە جەنگەکە هاتە دەرەوە. بەعس لە ناوەخۆ لاواز بوو، هەر بۆیە گەلانی عێراق بە عەرەب و کورد دەستیان بە راپەڕین کرد، لەم راپەڕینە چەندین شار لە کوردستان و باشووری عێراق ئازادکران.

راپەڕینە مەزنەکەی ساڵی ١٩٩١ و کۆڕەوە ملیۆنیەکەی هەمان ساڵ، دەرفەتێکی لە باری بۆ کورد رەخساند، تا شێلگیرانە بۆ هێنانەدی مافەکانی



کۆڕەوی کوردان لەساڵی ١٩٩١

کار بکات، چونکە ئەم راپەڕینە مێژووییە هەموو ئەو ناوچانەشی گرتەوە، کە بەعس دەیان ساڵ بوو خەریکی سڕینەوەی مۆرکە نەتەوەییە کوردییەکانی بوو.

لە مایسی هەمان ساڵ کورد چووە ناو دانوستاندنەوە لەگەڵ حکومەتی عێراق، بەمەبەستی بەدیهێنان و چەسپاندنی مافەکانی لە عێراق، بەڵام دانوستاندنەکە زوو گەیشتە بنبەست، لەبەرئەوەی حکومەتی ئەوسای عێراق هەرگیز رازی نەبوو بە داواکارییەکانی کورد، کە یەکێکیان (**گەڕانەوەی ئاوارەکانی کەرکوک بوو بۆ زێدی خۆیان**). پرۆسەی بەعەرەبکردن و راگواستن کە حکومەتی عێراق پێشتر دەستیپێکردبوو، لە ساڵی ١٩٩١ بەرفراوانتر و مەترسیدارتر بوو بەتایبەتی بۆ تێکدانی باری ئیتنۆگرافی و

نەتەوەیی پارێزگای کەرکوك و شارەکانی دیکەی ژێر دەسەڵاتی رژێمی بەعس تا روخانی رژێم لە ( ٩ /٤ /٢٠٠٣).

هەرچەندە لە دوای روخانی رژێمی بەعسەوە چارەنوسی ناوچە دابڕێنراوەکان بەستراوەتەوە بە مادەی (١٤٠)ی دەستوری نوێی عێراق، کە بەپێی ئەم مادەیە دەبوایە تا کۆتایی ساڵی (٢٠٠٧) کێشەی پاکتاوی رەگەزی لەم ناوچانەدا چارەسەر بکرابایە و چارەنوسیان دیاریبکرابایە، کە دەچنە سەر سنووری حکومەتی هەرێمی کوردستان یا لەگەڵ دەسەڵاتی ناوەند دەمێنەوە، بەڵام تاکو ئێستا جێبەجێنەکراوە و ئەو بەندە دەستوریانەش مسۆگەر نین لەبەردەم هێزە توندڕەوە عەرەبیەکاندا تاکو بەرجەستەبێت.




داواکاری ناوچە دابڕێنراوەکان بە جێبەجێکردنی مادەی (١٤٠)ی دەستوری نوێی عێراق

## قۆناغی حەوتەم: قۆناغی دوای روخانی رژێم ساڵی ٢٠٠٣

قۆناغی دوای روخانی رژێمی بەعس لە ناوچە دابڕێنراوەکان، لە ساڵی (٢٠٠٣ تاکو ئێستا)، کە کێشەیەکی زۆری لەسەرە، لەنێوان کورد و دەسەڵاتی ناوەندی لە بەغدا لەلایەك، دانیشتوانی کوردو گروپە تیرۆرستەکان لە لایەکی تر، کە هەرەشە لە گیان و سامانی هاوڵاتیانی کوردنشینی ناوچەکانی (سەعدیە و جەلەولا و قەرەتەپە و شەنگال و رۆژئاوای کەرکوك دەکەن، بۆ بەزۆر دەرپەڕاندنیان لە شوێنەکانیان بۆ ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی حکومەتی هەرێمی کوردستان. هەر چەندە حکومەتی ئێستای عێراق بە ئاشکرا پەیڕەوی بەردەوامبوونی سیاسەتی بەعەرەبکردن و راگواستن ناکات، بەڵام بێدەنگ بوون و دەستەوەستانی لەبەرامبەر گروپە تیرۆستە نەژاد پەرستەکان لە پاراستنی گیان وسامانی هاووڵاتیانی کورد و هەڵپەساردنی مادەی (١٤٠)ی دەستور. هۆیەکە بۆ بەردەوامبوونی سیاسەتی بەعەرەبکردن و راگواستن و پاکتاوی نەژادی گەلی کورد لە ناوچە دابڕێنراوەکان.



خۆپیشاندانی توێژەکانی کەرکوك لە دژی پەیڕەوکردنی سیاسەتی صدام لە تۆقاندن و دەرکردنی دانیشتوانەکەی

## پرسیارەکانی بەشی یەکەم

**پ١. ئەم زاراوانە پێناسە بکە :**

بەعەرەب بوون ، یەکێتی سۆسیالیستی عەرەب ،ئەشکەوتی دەکا ، ڕێکەوتنامەی جەزائیر ،پشتێنەی ئەمنی ،گەردلوولی بیابان ، کۆڕەو ، مادەی ١٤٠ ، قەسابخانەی صوریا.

**پ٢.ئەم بۆشایانە پڕبکەرەوە :**

١. بە بڕیاری کۆمەڵەی نەتەوەکان لە١٦کانونی دووەمی١٩٢٥ ............. بە فەرمی بوو بە بەشێك لە جەستەی دەوڵەتی عێراق.

٢. بە پێی یاسای ژمارە ٢٩ ساڵی ١٩٣٨ مافی خاوەنداریەت بە رەسمی درا بە هۆزە عەرەبەکان لە ناوچە کوردییەکان و نیشتەجێکردنیان بەتایبەتی لە .......،......،......،.........،........ .

٣. قەسابخانەکەی شاری سلێمانی لە ......... ساڵی ..... بووە هۆی گوللە بارانکردنی(٢٨٠) هاووڵاتی کورد .

٤. لە رۆژی ........... هێزی ئاسمانی عێراق هێرشێکی دڕندانەیان کردە سەر شاری قەلآدزێ و بووە هۆی گیان لە دەستدانی ........ کەس .

**پ٣.هۆی ئەمانە رونبکەوە :**

١. لە دوای لکاندنی ویلایەتی موسڵ (باشوری کوردستان ) بە دەوڵەتی نوێی عێراق ، کورد لە زۆرینەی نەتەوەیی دەبێتە کەمینە بە گوێرەی عێراق؟

٢. دەسەلآتدارانی عێراق بەردەوام پیلان و نەخشەیان دارشتووە بۆ دارشتنەوەی پێکهاتەی نەتەوەی و دیمۆگرافی لە کوردستان .

٣. کورد دامەزراندنی کۆماری یەکگرتووی عەرەبی بە مەترسیەکی گەورە بۆ سەر شوناسی نەتەوەی خۆی دەزانی .

٤. قۆناغی نێوان سالآنی (١٩٨٠ ـ ١٩٩١)بە مەترسیدار ترین رەوش دادەنرێت لە سیاسەتی بە عەرەبکردن و راگواستنی کورد.

**پ٤. شێوازەکانی راگواستنی کورد لە دوای رێکەوتنامەی جەزائیر بە چ شێوازێك ئەنجام درا .**

**پ٥. بۆ پەیرەوکردنی سیاسەتی بە عەرەبکردن و راگواستنی کورد لە دوای کودەتای حەرەس قەومییەکان چ رێگایەکی پەیرەو کرد .**

**پ٦. دانیشتوانی کورد لە کوردستانی عێراق بە پێی ئاماری سالّی ١٩٥٧ چۆن پۆلین دەکرێت ؟**

**پ٧. ئەم دەستە واژەیە چۆن لێك دەدەیتەوە :(کورد بەشێکە لە نەتەوەی عەرەب و کوردستانیش بەشێکە لە نیشتمانی عەرەب).**

**پ٨. تایبەتمەندی پەلامارەکانی نێوان (١٩٨٧ ـ ١٩٨٩)بۆ سەر ناوچە کوردنشینەکان لە لایەن سوپای بەعس بژمێرە .**

# بەشی دووەم
# کوردە فەیلیەکان

## کورتەیەکی مێژوویی دەربارەی کوردە فەیلیەکان:

کوردە فەیلیەکان بە درێژایی مێژوو لە ڕۆژهەڵاتی دیجلە ژیاون و بەشێکی دانەبڕاون لە نەتەوەی کورد.

ئەم زارەوەیە (فەیلی) بە کۆمەڵە هۆزێکی لوڕی دەوترێت، کە نیشتەجێی (پێشکۆ و پشتکۆ)ی زنجیرە چیاکانی زاگرۆس بوون، زۆربەی مێژوونوسان، کۆکن لەسەر ئەوەی کە لە ڕەچەڵەکی ئیلامی یا گۆتییەکانن، لە ناوەڕاست و باشووری عێراق ژیاون، لە ناوچەکانی (مەندەلی، زرباتییە، بەدرە، جەسان، خانەقین، کەرکوک، بەغدا، کوت، عەمارە و بەسرە).

ڕۆژهەڵاتناسی روسی (ڤلادمێر مینۆرسکی) و هەریەك لە (جۆن ماڵکۆن و براون) و توێژەری کوردی (د. اسماعیل قوماندار) پشتگیری بۆچوونەکەی دەکەن، کە بڕوای وایە سەرەتاکانی دەرکەوتنی زاراوەی (فەیلی) لە سەدەی شازدە بووە، بۆ جیاکردنەوەی میرنشینی (لوڕی بچووك) وحوکمڕانەکەی کە خۆیان بە لوڕی ڕەسەن دادەنا، بە بەراورد لەگەڵ (لوڕی گەورە) کە وایان دادەنا، لوڕی بچووك بەشێکن لە لوڕی گەورە، نەك ڕەسەن و بنچینە. سەرەڕای ئەوەی ئەم زاراوەیە لەم ناوچانە بە دەگمەن بەکارهاتوە، بەڵام لەسەدەی نۆزدەهەم، تەنیا لەلایەن دانیشتوانی پشتکۆ بەکارهاتووە. لە سەردەمی ئێستاش ئەم زاراوەیە تەنیا بۆ ئەو کوردانە بەکاردەهێنرێت، کە نیشتەجێی ئەو ناوچانەن بەر دەوڵەتی عێراق کەوتون، لەدوای دیاریکردنی

سـنووری نێـوان ئێـران و عوسمانییـەکان لـە سـاڵ ١٩٠٥. بـەڵام دانیشـتوانی خانـەقین و مەنـدەلی کـە کـوردی گەرمەسـێرن، ئـەم زاراوەیـە بـۆ ناسـاندنی خۆیان بەکارناهێنن.

هەندێك لە توێژەران بڕوایان وایە کە بنچینەی زاراوەی فەیلی، لەناوی پاشای ئیلامی (بیلی) هاتووە، کە بنەماڵەکانی دەوڵەتی (ئیلامیان) لە ساڵی (٢٦٧٠ پ. ز) دامەزراندوە. ناوی ( بیلی ) بەدرێژایی ڕۆژگار گۆڕاوە بۆ (فـەیلی)، بـە گۆڕانی بڕگەی (با) بـۆ (فـا)، هـەروەك گـۆڕانی نـاوی (بـارس) بـۆ (فـارس)ی ئێستا.

(بهلە) وەك ڕووبەرێکی جوگرافیایی بۆ یەکـەمجار، کـە لەسەرچـاوە عەرەبیـە ئیسلامیەکاندا هاتووە، لە سەدەی دەیەمی زایینی لە کتێبی (مختصـر تـاریخ البلدان)ی (ابن فقیە الهمدانی )، ئاماژەی پێکراوە، ئـەم ناوچـانە دەگرێتـەوە (هەمـەدان، ماسـین (ئـیلام)، سمـرە (درشـهر)، مـاە البصـرە (نهاونـد)، مـاە الکوفە (دینور) و کرمنشاە). ابن ندیم لە کتێبی (الفهرست) هـەر ئـەو شـارانە باس دەکات کە سەر بە (فهلە)ن، هەروەك (تەبەری) لە کتێبی (تاریخ الرسـل و الملوك) کەوا (فهلو) خەڵکی هەرێمی چیاکانن. لێرەوە بۆمان دەردەکـەوێت کـە کـوردە فەیلییـەکان دانیشـوانی ئەوپـەڕی باشـووری کوردسـتانن. ئـەم ناوچانەش تـەنها (پشتکۆ) و (پێشکۆ) دەگرێتـەوە. نـاوی (لـوڕ) بـەو هۆزانـە دەوترێت کـە لـە بەشـی ڕۆژهـەڵات و باشـووری کوردسـتان نیشـتەجێن و بـە هەموو لوڕەکانی دانیشتوی عێراق دەوترێت (فەیلی).

## سەرەتای نەهامەتی کوردە فەیلییەکان:

کێشەی کوردە فەیلییەکان وەك کێشەی عەرەبە شیعەکان پەیوەستە بەو ململانێ سیاسیە دوور و درێژەی نێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانی تورك و سەفەویی ئێرانی، کە ڕێخۆشکەر بوو بۆ دابەشکردنی دانیشتوانی ناوچەکە لە نێوان دووکەوتەی ئێرانی و عوسمانی. زۆر لە شیعە عێراقیەکان بە دووکەوتەی ئێرانی ناونوسکران، کە لەناویاندا کوردە فەیلیەکان بوون لە سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقی ڕووبەڕووی جیاکردنەوە (هاوێڵکردن) بوونەتەوە لەگەڵ توێژ و چینەکانی تری کۆمەڵگەی عێراق.

لە ساڵی ١٩٢٤ یاسای ڕەگەزنامەی عێراقی جەختی لەسەر دابەشکردنی گەلی عێراق کردەوە بۆ سێ بەش لەسەر بنەمای ئایین و نەتەوە. کوردە فەیلیەکان لەبەر ئەوەی لە پەیڕەوانی ڕێبازی شیعە مەزهەب بوون، بە ڕەچەڵەکی ئێرانی ناو نوسکران، بۆیە بە بەردەوامی کەوتنە بەر هێرشی دەسەلأتدارانی عێراق.



کوردە فەیلییەکان لە خیوەتگاکانی سەر سنوری ئێران

لەگەڵ دەست بەسەرداگرتنی دەسەڵات، لەلایەن بەعسیەکانەوە، لە ساڵی ١٩٦٨ بەدواوە، کوردە فەیلیەکان رووبەرووی شاڵاوی توندی راگواستن و لەناوبردن بوونەوە. لەسەرەتای حەفتاکان رژێم نزیکەی (٤٠٠٠٠) چل هەزار کوردی فەیلی راگوێزی ئێران کرد، بەبیانوی ئەوەی کە رەچەڵەکیان ئێرانیە. لە درێژە پێدانی ئەم سیاسەتە رەگەزپەرستیە، لەساڵی ١٩٨٠ بەپێی بڕیاری ژمارە (٦٦٦)، مافی هاوڵاتیبوونی لێسەندنەوە، ئینجا دەست بەسەر ماڵ و سامانیان داگیرا.

ئامانجی لەناوبردنی ئەو توێژە رەسەنەی گەلی کورد، بۆ بنبڕکردنی کورد بوو لە بەغدا و شوێنە عەرەبنشینەکانی عێراق. ژمارەیەکی ئێجگار زۆریان بەوپەڕی رەفتاری درندایەتی و نامرۆڤانەوە، بە زەوتکردنی ژن و کوشتنی پیاو و منداڵەکان دەستپێکرد، کە لە مێژوو کەم وێنە بووە. سەرەڕای ئەم هەموو زۆرداریەی کە بەرامبەریان دەکرا، هەر بەوە نەوەستان بەڵکو دەستکرا بە رەشبگیرکردنی هەزاران گەنجی فەیلییەکان وەك بارمتە، کە تائێستا بێسەروشوێنن و هیچ زانیاریەکیان لەبارەوە نازانرێت.

رژێم چەمکی رەچەڵەکی ئێرانی کردە بیانو بۆ راگواستنیان، بەکۆمەڵ لە ناوچەکانی بەغدا و شار و شارۆچکەکانی تری عێراق، دووریخستنەوە بۆ سنوورەکانی عێراق - ئێران، لەپێش و لەدوای جەنگی (١٩٨٠ — ١٩٨٨) بەبێ گوێدانە هیچ یاساو مافێکی مێژووی ئەم گەلە.

ساڵی (١٩٨٠) وەزیری ناوخۆی عێراق، بڕیارێکی دەرکرد بە دوورخستنەوەی ئەو کەسانە کە بەرەچەڵەك ئێرانین و لە عێراقدا دەژین، رەگەزنامەی عێراقییان نییە. لە چوارچێوەی ئەم بڕیارە ئەو گەنجانە کە تەمەنیان

لەنێوان (١٨— ٢٨)ساڵدا بوو، وەك دەسبەسەر لەلای رژێم مانەوە، ئەوانی تریش بەرەو سنوورەکانی ئێران دوورخرانەوە. بڕیارەکە جەختی کردەوە هەر کەسێك بیەوێت بۆ عێراق بگەڕێتەوە دەبێ گوللەباران بکرێت.

لەمیانەی چەوساندنەوەو توندوتیژی، سەرۆکی پێشوی عێراق (صدام حسین)، داهێنانێکی نوێی هێنا کایەوە، ئەو پیاوەی عێراقییە و ژنەکەی فەیلییە دەبێ لێی جیابێتەوە، بەرامبەر بە (٤٠٠٠) چوار هەزار دینار ئەگەر سەرباز بێت، (٢٥٠٠) دوو هەزار و پێنج سەد دینار ئەگەر سڤیل بێت.



دەرکردنی کوردە فەیلییەکان بۆ سنورەکانی ئێران (دەروازەی منزریە)
بەبێ هیچ پێویستێکی ژیان

لە میانەی بەردەوامبوونی سیاسەتی پاکتاوکردنی کورد، تەنیا لە ٤ی نیسانی ١٩٨٠، (٥٠٠٠) پێنج هەزار کوردی فەیلی بە کۆمەڵ لە ناوبردران.
بەپێی ئامارەکانی خاچی سوور و مانگی سووری نێودەوڵەتی (٤٠٠٠٠٠) چوار سەد هەزار هاووڵاتی فەیلی بوونە قوربانی ئەم سیاسەتەی رژێم بە کوژرا و راگوێزراوەوە.



لەیادی (٢٩) ساڵەی راگواستنی کوردە فەیلییەکان رۆژی (٢٠٠٩/٤/٣) لە شەقامی کیفاح لە بەغدا، بنکەی کوردە فەیلییەکان

لە دوای روخانی رژێم لە ساڵی (٢٠٠٦) یاسای رەگەزنامەی عێراقی، بڕیاری (٦٦٦) ساڵی ١٩٨٠ی پوچەڵکردەوە، کە پەیوەست بوو بە سەندنەوەی رەگەزنامەی عێراقی لەلایەن رژێمی پێشوو. ژمارەیەك توانیان مافەکانیان بەدەست بهێننەوە، بەڵام ژمارەیەکیان تا ئێستا نەیانتوانیوە ئەو مافانە بەدەست بهێننەوە، چونکە بۆ گێڕانەوەی مافەکانیان پێویستیان بە

بەڵگەنامە هەیە کە رەچەڵەکی عێراقی خۆی بسەلمێنێ، دەبێ لە سەر ژمێری ١٩٥٧ ناونوس کرابێت، بەلآم خەڵکێکی زۆر بەڵگەنامەکانیان نەماوە، لەبەر ئەوەی رژێم لەکاتی شالآوەکانی دەرکردن و گرتنەکان هەمووی لەناوبردووە.



دادگای بالآی تاوانەکانی عێراق کێشەی کوردە فەیلییەکانی بەجینۆساید ناساند

## پرسیارەکانی بەشی دووەم

**پ١. ئەم زاراوانە پێناسە بکە :**

کوردی فەیلی ،دووکەوتەی ئێرانی(التبعیة الایرانیة) ، دەوڵەتی ئیلامی.
پشتکۆ و پێشکۆ.

**پ٢.ئەم بۆشاییانە پڕبکەرەوە :**

١.کوردە فەیلییەکان بە درێژایی مێژوو لە ناوەڕاست و باشوری عێراق ژیاون، لەم ناوچانە... .....، ..... .

٢.لە میانەی پاکتاوکردنی کورد تەنها لە رێکەوتی ........... پێنج هەزار کوردی فەیلی بەکۆمەڵ لە ناوبردران .

**پ٣.بڕیاری ژمارە ٦٦٦ ی ساڵی ١٩٨٠ چۆن مافی کوردە فەیلییەکانی پێشێل کرد .**

# بەشی سێیەم

## کۆمەڵکوژی بارزانییەکان

بــارزان ناوچــەیەکی شــاخاوییە، دەکەوێتــە نزیــك سێگۆشــەی ســنووری، ( ئێران و تورکیا و عێراق)، لــە پارێزگــای هــەولێر. دانیشــتوانەکەی لــە رووی دیمۆگرافیەوە بە سەر نزیکەی (٤٠٠) چوار سەد گوند دابەش دەبن.




نەخشەی ژمارە (٢) دابەشبوونی هۆزەکانی بارزان*

* سەردار محمد عبدالرحمن، هوشیار محمدامین خۆشناو(ئەتڵەسی مێژووی بزاڤی رزگاری خوازی کوردستان)

بارزانییەکان  لە یەکگرتنی حەوت هۆزی دەڤەرەکە پێکهاتوون، (شێروانی، بەرۆژی، نزاری، دۆڵەمەڕی، مزووری، هەرکی بنەجێ و گەردی). ئەم هۆزانە لە پەیڕەوانی شێخانی بارزانن، هەر لەژێر ئەم چەترەش یەکیان گرتوە بەناوی بارزانی، کە لەناوی گوندی بارزان هاتووە و مەزارگەی خودانێ بارزانە.

دانیشتوانی ئەم ناوچەیە پێش دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقی نوێ، لە سەردەمی عوسمانییەکان، تووشی گرتن و راوەدونان و کوشتن بووەتەوە. لەدوای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقی نوێش نەهامەتتیەکان کەم نەبوونەتەوە، بەڵکو رۆژ بەڕۆژ رووی لە زیادبوون کردووە، لە راگواستن و کوشتن و دەربەدەر بوون، چ بۆ دەرەوەی کوردستانی عێراق بوو بێت یا بۆ ناوە.

هەر جارەی چەندین کەس بوونەتە قوربانی و بەتاڵان چوونی ماڵ و سامانیان و سوتاندنی گوند وێرانکردنیان لەلایەن رژێمە یەك لە دوای یەکەکانی عێراق.

## راگواستنی بارزانییەکان:

ئەم دەڤەرەش هەروەکو دەڤەرە کوردنشینەکانی تر، لەگەڵ سەرهەڵدانی هەر بزوتنەوەیەکی نەتەوەیی ئازادیخواز، حکومەتەکانی عێراقی هەموو رێگایەکیان گرتۆتە بەر بۆ لێدان و لە ناوبردن و راگوێزان و بە تالآن بردنی ماڵ و سامانی دانیشتوانەکەی، هەرجارەی ناو و ناتۆرەیەکی جیاوازیان دەخستە پاڵ گەلی کورد. هەرجارەی بە بیانۆیەك، جارێك بەناوی جیابوونەوە و جارێك بەناوی کرێگرتەی وڵاتانی بیانی و دەوروبەر، بۆ ئەوەی ببێتە بەهانەیەك بۆ رێخۆشکردن و لێدانی ناوچە کوردنشینەکان و



کۆمەڵگەی بارزانییەکان لە قوشتەپە، دوور لەپێداویستیەکانی ژیان

جێبەجێکردنی مەبەستەکانیان، لە بەعەرەبکردن و تواندنەوەی گەلی کورد، لە قاوغی نەتەوەی عەرەبیدا، بۆیە رۆژ بەرۆژ هێرش و پەلامارەکان توندتر دەبوونەوە و قوربانی زۆر ترو پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤیش زیاتر دەبوون. بارزانییەکان لەم هێرشانە پشکی شێریان بەرکەوتووە، چەندین جار لە زێدی باب و باپیرانیان راگوێزراون و تالآنکراون. هەر لە سەرەتای سییەکانی سەدەی رابردوو کەوتنە بەر پەلاماری لەشکری پیادەی عێراق، بە پاڵپشتی فڕۆکە جەنگیەکانی ئینگلیز، چەندین گوندیان وێرانکرد و دانیشتوانەکەیان بەرەو تورکیا رایانکردوە.

لە تشرینی یەکەمی ١٩٤٥، دیسان دانیشتوانەکەی جارێکی تر گوندەکانیان وێرانکرایەوە و ژمارەیەکی زۆریان ئاوارەی ئێران بوون. لە نیسانی ١٩٤٧ جارێکیتر ئەو خەڵکەی مابوونەوە، لە ژن و منداڵ و پیر لە (دیانا) دەسبەسەرکران، پیاوەکانیش بۆ بەندیخانەکانی (کەرکوك، موسڵ، بەغدا و

بەسرە) راگوێزران، بۆ چەند ساڵێك لەوێ مانەوە، پاشان خێزانەكانیان بەسەر گوندەكانی دهۆك و هەولێر دابەشكران.

لەدوای رێكەوتننامەی جەزائیر، كە  لە نێوان شای ئێران و حكومەتی عێراق لەساڵی ١٩٧٥ لە دژی بزوتنەوەی گەلی كورد مۆركرا، بووە هۆی شكستپێهێنانی بزوتنەوەكە. حكومەتی عێراق ئەم هەلەی قۆستەوە و كەوتە گیانی گەلی كورد بەگشتی، بارزانییەكانیش بەشێك بوون، كەوتنە بەر ئەم شاڵاوە نامرۆڤانەیە. لەدوای ساڵی ١٩٧٥پرۆسەی راگواستن فراوانتر كرا، هەندێكیان بەرەو ئێران رۆیشتن و هەندێكیشیان گەڕانەوە ناو كوردستان.



شوێنەواری بۆردومانی ئۆردوگای زێوە لەلایەن فڕۆكە جەنگیەكانی عێراق

ئەوانــەی لــە ئێـران گیرسـانەوە، لــە کۆمەڵگــە سـنووریەکانی نزیـك عێـراق نیشتەجێکران، بەتایبەتی ئۆردوگای زێوە، کـە چـەندین جـار لەلایـەن فڕۆکـە جەنگیەکانی عێراق بە ناپاڵم بۆردومانکرا، لەئەنجامی ئەو پەلامارە قوربـانی زۆری لێکەوتــەوە. ئــەو کەسـانەش کــە گەڕانــەوە کوردسـتان، ڕژێـم بــەرەو بیابانەکانی باشووری عێـراق رایگواسـتن، لــە پارێزگـای دیوانیـە، ناحیـەکانی (جحیش، خیریە و مەجوجیە) لە کۆمــەڵگا نیشـتەجێکران. لـەدوای خۆشـیان گوندەکانیان وێرانکرا و فەرمانیش درا هەر کەسێك بگەڕێتــەوە گونـدەکان لــە سێدارە دەدرێت. ئەو خەڵکــەش کــە لــە ناوچــەکەدا مابوونــەوە بـۆ کۆمەڵگــە زۆرەملێیــەکانی هــەریر و دەوروبــەری هــەولێر راگــوێزران و گوندەکانیشـیان لەگەڵ زەوی تەختکران.
بارزانییـە راگوێزراوەکـانی دیوانیـە، لـە سـاڵی ١٩٨٠ گەڕێندرانـەوە کۆمەڵگـە زۆرەملێیــەکانی قوشــتەپە لـــە هـــەردوو کۆمـــەڵگای (قــودس و قادســیە ) نیشتەجێکران، بەبێ هیچ پێویستیەکی مرۆیی.




نەخشەی ژمارە (٣) دابەشبوونی کۆمەڵگا زۆرەملێیەکان لە هەرێمی کوردستان*

---

* لە نەخشەکانی سەردار محمد عبدالرحمن / ئەتلەسی هەرێمی کوردستانی عێراق .

## جینۆسایدکردنی بارزانییەکان:

لـەدوای هەڵگیرسـانی جـەنگی نێـوان عێـراق ـ ئێـران، رژێـم لـە زۆربـەی بــەرەکانی شــەڕدا شکســتی دەخــوارد بەتایبــەتی لــە بــەرەکانی شــەڕی کوردســتان، ئەمـە لەلایـەك لـە لایـەکی تـر بەشـدارینەکردنیان لـە ریزەکـانی سوپای عێراق و بەشـدارینەکردنی گەنجـەکانی کـورد لـە (شـەڕی قادسـیە) و چوونە ریزی پێشمەرگە، بۆ رژێم بووە بارگرانیەکی گەورە لە کۆنترۆل کردنی ناوچەکە، بەتایبەتی لەدوای شکستەکانی سوپای عێراق لە بـەرەکانی حـاجی ئۆمەران، بۆ رژێـم بـووە بیانۆیـەك بـۆ تۆڵـە سـەندنەوە لـە کـورد بەگشـتی و بارزانییەکان بەتایبـەتی، کـە گوایـە هاوکـاری سـوپای ئێرانیـان کـردووە، بـۆ داگیرکردنی ناوچە سنووریەکانی بەرەی حاجی ئۆمەران.

لـە تــەمووزی ١٩٨٣ رژێـم بــە هێزێکـی گــەورە کــە پێکهـاتبوو لــە دەزگـا ئەمنیــەکان و گــاردی کۆمــاری، گــەمارۆی هــەردوو کۆمەڵگــەی (قــودس و قادسیە)دا لە شارۆچـکەی قوشـتەپە، کـە بارزانییـەکانی تێـدا نیشـتەجێبوو، دەسـتیکرد بـە گـرتنی نێرینـەی تەمـەن (١٥) سـاڵی تـاکو پیرەمێـردی (٩٠) ســاڵی، راپێچــی نــاو پاســی پــەردە پۆشــکران و بــەرەو شــوێنی نادیــار گواسترانەوە. لە مانگی ئابی هەمان ساڵ، پەلاماری کۆمەڵگە زۆرەملێیەکانی (بەحرکە و هەریر و دیانە)ی دا و نێرینەکانیان دەسگیرکرد و بە پاسی گەورە بــەرەو باشــوور رەوانــەکران. لــە مــانگی تشـرینی یەکـەم دووبـارە هــەڵیان کوتایەوە سەر هەردوو کۆمەڵگەی (قودس و قادسیە)، بـۆ ئـەو مێرمنداڵانـەی کە جاری پێشوو دەسگیر نەکرابوون، ئەمجارە هەموویان دەسگیرکردن.

لەم پەلامارانەی گرتن و راوەدونـان، نزیکـەی (٨٠٠٠) هەشـت هـەزار نێرینـەی بارزانی لە گەنج و پیر بە ساغ و نەخۆشەوە، تەنانـەت ئەوانـەی کـە لـە رووی دەرونیشەوە تەواو نەبوون دەسگیرکران و شونبزکران و ژن و منداڵەکانیشیان بەبێ سەرپەرشتی و بە ژیانێکی مەرگەساتی لە ئۆردوگاکان هێشتەوە.

بەپێی بەڵگەنامەکان، ئـەو پیـاوە بارزانیانـەی تەمـەنیان لـە ١٥ سـاڵ بـەرەو سەرەوە بوو بۆ بەغدا گواسترانەوە و رەوانەی دادگـای بـەناو شـۆڕش کـران، لـەم دادگایـە بـە شـێوەیەکی رەمـەکی حـوکمی لەسـێدارەدانیان بەسـەردا سـەپاندن، دواتـر حوکمەکـە جێبـەجێکرا. هەرچـەندە ئـەو تۆمەتانـەی کـە ئاراستەی ئەو کەسانە کرابوو بێبنەماو نادروست بوون، بەڵام بە دادگاییـەکی رووکەشانە سزای مەرگیان بەسـەر سـەپێندرا، هەندێکیشـیان پـاش گرتنیـان گواسترانەوە بۆ خوارووی عێراق، رەوانەی پارێزگای موسەنا (سەماوە) کران، لە ئۆردوگاکانی (ئەبوجد و ئەلیە)دا دەسبەسەرکران. ئەم شوێنە (٤٥)کـم لـە سنووری سعودیە دوورە، ناوچەیەکی بیابانی لماوییە.



دایکان لەسەر گۆڕی کەسوکاریان، لە دوای هێنانەوەیان لە بیابانی بوسەیەی موسەنا

## زینده بەچاڵکردن:

بارزانییەکان بە شێوازی جیاجیا زیندە بەچاڵکران، بەپێی راسپاردەکانی بەڕیوەبەری ئەمنی گشتی لە سەرەتای مانگی ئابی ۱۹۸۳ فەرمانی لەسێدارەدان بەسەر بەشێکیان جێبەجێکرا و (١٦) شادە دۆز بۆ (٦٦٧) شەش سەد و شەست و حەوت کەس رێکخرا و حوکمی لەسێدارەدانیان بۆ دراوە و بەشەکانی دیکەش بە شێوازی جۆراوجۆر لە بیابانی (بوسەیە) لە باشووری رۆژئاوای عێراق زیندە بەچاڵکران.

لەدوای روخانی رژێم لە ساڵی ۲۰۰۳، لە مانگی تشرینی یەکەمی ۲۰۰۵ بەڕێورەسمێکی شایستە، تەرمی (٥١٣) پێنج سەد و سێزدە کەس، کە لە گۆڕە بەکۆمەڵەکانی بیابانی بوسەیە زیندە بەچاڵکرابوون، گەڕێندرانەوە زێدی باب و باپیرانیان لە نزیك بارزان دووبارە بە خاك سپێردرانەوە.



رێورەسمی دووبار ناشتنەوەی زیندە بەچاڵکراوەکانی بارزانی لە گۆڕستانی بارزان

## پرسیارەکانی بەشی سێیەم

**پ١. ئەم زاراوانە پێناسە بکە :**

بارزانییەکان ،کۆمەڵگای قودس و قادسیە ، بیابانی بوسەیە ، ئۆردوگای زێوە.

**پ٢.جینۆسایدکردنی بارزانییەکان لە تەموزی ١٩٨٣ رونبکەوە .**

**پ٣.ئەم دەستەواژە رونبکەوە :**

( ئەوانە خیانەتیان لە پەیمان کرد ، بۆیە ئێمەش بە سزای توندو سەختمان گەیاندن و بۆ دۆزەخمان ناردن ).

**پ٤.لە هەر شوێنێکی ئەم کوردستانە چیت بینوە یا بۆیان گێڕاویتەوە دەربارەی بارزانییەکان ، یا هەر گروپێکی تری کورد ،بە چیرۆك یا بە راپۆرت، بینوسەوە و لە پۆل بۆ هاورێکانتی بخوێنەوە .**

## بەشی چوارەم

# بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی

**بەچەکی کیمیاوی هەموویان (کوردەکان ) دەکوژم، کێ بەنیازە هیچ قسەیەك بکات؟ هەرچیەك دەڵێن بابیڵێن! کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی و ئەوانەش کە گوێ لەوانە دەگرن.**

**(عەلی حەسەن ئەلمەجید)**

وەك لە بەشەکانی پێشتر باسمانکرد، لەدوای لکاندنی ویلایەتی موسل بە عێراقی عەرەبی، کێشەی کورد تێکەڵ بە هاوکێشە سیاسیەکانی عێراق کرا. بە درێژایی مێژووی دەوڵەتی عێراق کێشەی کورد بووە بە مەترسی و بەردەوام رژێمە عێراقیەکانی نیگەران کردووە. بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە، هیچ کام لە رژێمەکانی عێراق، نەیانتوانیوە رێگا چارەیەکی دروست بدۆزنەوە و دانیشتوانی عێراق لە مەترسی دوور بخەنەوە، تەنیا زمانی چەك بەکارهاتووە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە، چونکە بە بڕوای سەرانی رژێمەکان، کوردستان بەشێکی دانەبڕاوە لە نیشتمانی عەرەبی، گەلی کوردیش بەشێکە لە نەتەوەی عەرەب، کە گەلی عێراق بەشێکە لەم چوارچێوەیە. هەر لەم روانگەیە بوو، سیاسەتی پاکتاوی رەگەزی کورد سەرەتا بە عەرەبکردن و راگواستن دەستپێکرد، تا گەیشتە ئەو تاوانە گەورەیەی کە چەکی کۆمەڵکوژ و کیمیاوی قەدەغەکراوی نێودەوڵەتی بەکارهێندرا.

لەدرێژە پێدانی سیاسەتی راگواستن لە ساڵی ١٩٨٧، گوندەکانی سەر بە چەمچەماڵ و کۆیە و قەڵادزێ و ناوچەی سلێمانی ناچار کران گوندەکانیان

بەجێبێلن، دیارە ئەم کارەش نارەزایی خەڵکەکەی لێکەوتەوە، بۆیە رژێم لە نیسانی ١٩٨٧ بە چەکی کیمیاوی هێرشی کردە سەریان. بریندارانی ئەم هێرشە کە روویان لە نەخۆشخانەکانی ژێر دەسەڵاتی رژێم کرد بۆ چارەسەرکردنیان، دەرگایان بەروو داخرا و چارەسەرکردنیان قەدەغە بوو. یەکەم هێرشی چەکی کیمیاوی بۆ سەر ناوچە کوردنشینەکان لە کوردستان لە ١٥ی نیسانی ١٩٨٧ بە هۆی فرۆکە جەنگیەکان دەستپێکرد، بۆ سەر ناوچەکانی سۆران و رەواندوز و دوکان و سەرچنار و گوندەکانی مەرگە و پشدەر، هێرشەکان بە گازی ژەهراوی بەردەوام بوو تا ٢١ نیسانی ١٩٨٧، هەر لەم هێرشانە گوندێکی زۆری ناوچەکانی خۆشناوەتی و دۆڵی بالیسان و دەوروبەری سلێمانی و قەرەداغ بەرکەوتن. لە پارێزگای دهۆکیش هەندێك گوندی سەر بەشارۆچکەی ئەتروش و باکرمان کیمیابارانکران.

لە ٢٤ی مایسی ١٩٨٧ هێرشی ئاسمانی بە چەکی کیمیاوی کرایە سەر دەوروبەری شاری کەرکوك کە تەنیا ٢٠ کم لە شارەکە دووربوو، وەك (گورگان و تۆمار). لە ئەیلولی ١٩٨٧ بە دواوە گەورەترین هێرشی کیمیاوی کرایە سەر دۆڵی جافایەتی کە دەکەوێتە نێوان شاری سلێمانی و قەڵادزێ. لە ٣ی ئەیلول پتر لە ٣٠ گوندی ئەم ناوچەیە بە گازی کیمیاوی تۆپبارانکران، هەندێکیان بۆ جاری دووەم و سێیەم بوو.

لە ٦ی ئەیلول دەوروبەری شارۆچکەکانی شەقڵاوە و کۆیە و بەدرێژایی چیای سەفین کیمیابارانکران، بەتایبەتی ناوچەی هیران و نازەنین، بۆ چەند جارێك.




نەخشەی ژمارە(٤) ناوچە کیمیا بارانکراوەکانی هەرێمی کوردستان *

---

* لە نەخشەکانی سەردار محمد عبدالرحمن / ئەتلەسی هەرێمی کوردستانی عێراق .

له ١٧ی ئەیلولی ١٩٨٧ فرۆکە جەنگیەکانی رژێم بە چەکی کیمیاوی هێرش کردە سەر ناوچەی بادینان، بەتایبەتی ئەو کۆمەڵگە زۆرەملێیانەی کە کورد و ئاشوری تێدابوو، لە نزیك سنوری تورکیا، کە زۆربەی دانیشتوانەکەی خەڵکی دهۆك و ئەتروش و ئەڵقوش بوون، لە ترسی رژێم رایانکردبوو. ئەو خەڵکە هەڵاتووە کە لە سنورەکانی تورکیا گیرسابوونەوە، حکومەتی تورکیا بەهیچ جۆرێك رێگای نەدا بپەڕنەوە ناو خاکەکەی، هەڕەشەی کردبوو ئەوەی سنوور ببەزێنێت رادەستی حکومەتی عێراقی دەکاتەوە، بەتایبەتی دانیشتوانی کۆمەڵگەی زۆرەملێی (گوندی کانی). رژێم جارێکی تر لە مانگەکانی (١٠،١١،١٢)ی ساڵی ١٩٨٧ سنورەکانی تورکیاو ئێرانی ناوچە کوردنشینەکانی کیمیابارانکرد. بە بەردەوامی خۆی لەو دەنگۆیانە دەپاراست، کە باسی لە کیمیابارانکردنی ناوچە کوردیەکان دەکرد.

(کۆمەڵەی گەلانی هەڕەشە لێکراو)، بڵاویکردەوە، کە رژێمی عێراق لە مانگی نیسان تا تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٨٧ پتر لە ( ٢٠٠)دووسەد گوندی لە کوردستانی عێراق بە چەکی کیمیاوی تۆپباران کردووە. پتر لە (٥٦٠) پێنج سەدو شەست کەس بوونە قوربانی چەکی کیمیاوی، کە شوێنەواری لەسەر جەستەیان دیاربووە. لە ١٦ی نیسانی ١٩٨٧، فرۆکە جەنگیەکانی عێراق سەدەها بۆمبی کیمیاویان بە سەر گوندەکانی شێخ وەسانان و بالیسان و کانی بەرد و توتمە و زینێ و بێراوە و بالوکاوە داباراند، هەر لەهەمان رۆژدا زنجیرە چیاکانی هەریر و کاروخ...هتد، بە فرۆکە کیمیابارانکرد، سەدان قوربانی لە بریندار و کوژراوی لێکەوتەوە، زۆرترین قوربانی بەر گوندی شێخ وەسانان کەوت، کە هیچ کەسێکیان بە سەلامەتی لەم هێرشە دەرنەچوو.

رۆژ بە رۆژ بەکاهێنانی ئەم چەکە ترسناکە تا دەهات لە زیادبوون دابوو، لە قۆناغەکانی ئەنفال گەیشتە لوتکەی بەکارهێنان، رژێم بەبێ سڵەمینەوە هەر بەرگریەکەك یا کۆسپێك لە شوێنێك بهاتابایە پێش سوپای رژێم بە چەکی کیمیاوی چارەسەریان دەکرد. هۆیەکەشی بۆ بێدەنگی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی و بێکەسی گەلی کوردو گۆشەگیری لە ناوچەیەکی دابڕاوادا دەگەڕێتەوە.



پەیکەری عومەری خاوەر و مۆنۆمێنتی شەهیدانی هەڵەبجە

## کیمیابارانکردنی شاری هەڵەبجە:

بەهۆی ستراتیژیەتی شوێنی جوگرافی شارەکە، کە هاوسنووری ئێرانەو رێگایەکی بازرگانییە و مێژووی دوور و درێژی بەرهەڵستی کردنی دانیشتوانەکەی لە دژی زۆرداری رژێمی بەعس، گەواهی خۆڕگری و لە

خۆبوردەیی دانیشتوانەکەی بووە. ئەم هۆکارانە وای لە رژێمی بەعس کرد، چاوی زیاتر بخاتە سەر دانیشتوانی ئەم ناوچەیە. هەڵەبجە بەلایەنگری نەیارانی رژێم ئەژماردەکرا، لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٨، کە هێزی پێشمەرگە توانیان شارەکە و دەوروبەری لەدەست رژێم دەربێنن، بۆ رژێم بووە بەهانە بۆ درێژە پێدانی سیاسەتی پاکتاوی رەگەزی کورد، هێرشێکی بەربلاوی کردە سەر ناوچەکە، وەك کاردانەوەیەك بەرامبەر هێرشی پێشمەرگەی کوردستان، لەم شاڵاوەدا زۆر لەشار و شارۆچکەکانی کوردستانی وێرانکرد، یەکێك لەم شارانە هەڵەبجە بوو. شایانی باسە شاڵاوی کیمیاباران بۆسەر هەڵەبجە، بەشێك نەبوو لە زنجیرە شاڵاوەکانی ( ئەنفال) بۆ لە ناوبردنی کورد.

لەشەوی (١٥-١٦ی ٣ ی ١٩٨٨) بۆردومانی تۆپ و کاتیۆشای دوورهاوێژ بۆ ناو شار دەستپێکرد.

خەڵکێکی زۆر لە رۆژانی پێشوتر شاریان جێهێشتبوو، چووبوونە دەرەوەی شار. سەر لە بەیانی رۆژی ١٦ی ٣ی ١٩٨٨ حەوت فرۆکەی جەنگی هاتنە سەر شارەکە، بە موشەك و ناپاڵم شارەکەیان بۆردومان کرد، کە ژمارەیەك خەڵك کوژران و خانووبەرەیەکی زۆریش وێرانکرا. لەو کاتە ئیتر هەستکرا کە دوژمن نیازی خراپی هەیە، بۆیە داوا لە دانیشتوانەکەی کرا شار چۆلبکەن، بەلام خەڵکێکی زۆر لەشار مانەوە، لە ترسی بۆمبارانکردن لە ژێر زەمینی خانووەکانیان خۆیان حەشاردابوو. ئەو بۆمبایانەی کە لە کاتژمێر یازدە شاری پێ بۆمبابارانکرد چەکی کوشندەی تێکەلاوبوو لە بۆمبی گەورەی ئاسایی و ناپاڵم و کیمیاوی، بۆیە بڕیاردرا تا شەو دادێت ئینجا خەڵکەکەی

ڕەویکەن، بەڵام فڕۆکەکانی ڕژێم بەردەوام بەسەر ناوچەکەدا دەسوڕانەوە و دەرفەتیان نەدا خەڵکەکە خۆیان ڕزگار بکەن.



(١٦ ئاداری ١٩٨٨ ) لەکاتی بوردمانکردنی هەڵەبجە

چڕترین بۆردومانی کیمیاباران کاتژمێر (٥,٢٠) ئێوارەی ١٦ی ئادار دەستی پێکرد، تا سەر لەبەیانی ڕۆژی ١٧ ئادار، (١٤) جار فڕۆکەکان بە بەردەوامی بۆردومانی شارەکەیان کرد.

سەرئەنجام ئەم بۆردومانە چڕە دڕندانەیە بووە هۆی کوشتی زیاتر لە ( ٥٠٠٠) پێنج هەزار کەس، لە ژن و منداڵ و گەنج و پیر، هەروەها بریندابوونی زیاتر لە (١٠) دە هەزار کەس و ئاوارەبوونی خەڵکی ناوچەکە بەرەو ئێران و ناوچەکانی تری وەك سلێمانی و دەوروبەری و کاولکردنی شارەکە

بەتـەواوەتی و کوشـتنی هەرچـی پەلـەوەر و مـالآتی ناوچـەکە بـوو هـەمووی قڕکرد.



رزگاربووانی کیمیابارانی هەڵەبجە

ئـەم هێرشـە کـە لەناوەڕاسـتی ئـاداری ١٩٨٨ بەچـەکی کیمیـاوی لـە لایـەن سوپای عێراقەوە کرایە سەر هاووڵاتیانی کورد، ئەمجارە نەك هێرشێکی گازی کوشندە و ژەهراوی و مەترسیدار بـوو دژی گـەلی کـورد، بـەڵکو گـەورەترین هێـرش بـوو بـە گـازی ژەهـراوی لـە دوای جـەنگی یەکـەمی جیهانییـەوە ئەنجامدرابێ.

## پرسیارەکانی بەشی چوارەم

**پ١. ئەم زاراوانە پێناسە بکە :**

ناپاڵم ، هەڵەبجە ، کۆمەڵگەی زۆرەملێی ( گوندی کانی ) ، شێخ وەسانان ، گورکان و تۆمار ، چەکی کۆمەڵ کوژ .

**پ٢.هۆی ئەمانە لێك بدەرەوە :**

١. ئەو کۆمەڵگە زۆرە ملیانەی کە کورد و ئاشوری تێدابوو لە نزیك سنوری تورکیا ،کە لە ترسی رژێم رایانکردبوو، لە سنورەکانی تورکیا گیریان خواردبوو .

٢. رژێم بە بێ سڵەمەنینەوە هەر بەرگریەکەك یا کۆسپێك لە شوێنێك بهاتابایە پێش سوپای رژێم بە چەکی کیمیاوی بۆردومانیان دەکرد .

٣. رژێم لە ١٦ ئاداری ١٩٨٨ بە چەکی کیمیاوی هێرشێکی بەربلاوی کردە سەر شاری هەڵەبجە.

# بەشی پێنجەم

## ئەنفال

تاوانی ئەنفال یەکێکە لە گەورەترین و ترسناکترین ئەو تاوانانەی لە کۆتاییەکانی سەدەی بیست بەرامبەر بە گەلی کورد ئەنجامدرا. نوێترین سیاسەتی رەگەزپەرستانە بووە بۆ پاکتاوکردنی نەتەوەیەك لە سەر زێدی باب و باپیرانی.



### چەمکی ئەنفال:

ئەنفال لە زمانەوانیدا، کۆی (نفل)ە، کە بە دەسکەوت دێت. ناوی سورەتی هەشتەمە لە قورئانی پیرۆز، بە واتای ئەو دەسکەوتە دێت کە لەکاتی شەڕدا بەدەست شەرکەرە موسوڵمانەکان دەکەوێت. واتا سامان و سەروەتی بێبڕواکانە کە دەست موسولمانان دەکەوێت. لەم بارەیەشەوە بۆچوونی زانایانی ئیسلام سەبارەت بە چەمك و واتای ئەنفال (الانفال هو الغنيمة، أي

كل نيل ناله المسلمون من أهل الحرب). کەواتە ئەنفال لە ئاییینی ئیسلامدا ئەو دەسکەوت و سامانەیە کە موسوڵمانان لە بتپەرست و بێ باوەڕان وەك دەسکەوتی شەڕ دەستیان دەکەوێت. هەروەك لە سورەتی (الانفال)ی قورئانی پیرۆزەوە ئاماژەی پێکراوە:(يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْأَنْفَالِ قُلِ الْأَنْفَالُ لِلَّهِ وَالرَّسُولِ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَصْلِحُوا ذَاتَ بَيْنِكُمْ وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ) **(١ الانفال)**، هەروەها بەم شێوەیە باس لە چۆنیەتی دابەشکردنی دەسکەوتەکان دەکات: (وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُمْ مِنْ شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ إِنْ كُنْتُمْ آمَنْتُمْ بِاللَّهِ وَمَا أَنْزَلْنَا عَلَى عَبْدِنَا يَوْمَ الْفُرْقَانِ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) **(٤١الانفال).**

### هۆی دابەزینی سورەتی ئەنفال:

ئەگەر بۆ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم سورەتە بگەڕێینەوە، بە تەواوەتی چەمکی ئەنفالمان بۆ روندەبێتەوە.

هاوەڵێکی پێغەمبەر (د.خ) کە ناوی (عبادەی کوڕی صامت ) دەیگێڕێتەوە: (لەگەڵ پێغەمبەر (د.خ) چووین بۆ شەڕی (بەدر)و کەوتینە بەرامبەر بێباوەڕان. دوژمن تێکشکا، کۆمەڵێك لە موسڵمانەکان بە دوایان کەوتن، بۆ ئەوەی زیاتریان تێك بشکێنن، هەندێکی تریان دەوری پێغەمبەریان گرت، نەبادا زیانی پێبگات و کۆمەڵێکی تریش کەوتنە دوای ئەو دەسکەوت و پاشماوانەی کە بێباوەڕان لە دوای خۆیان بەجێیان هێشتبوو. بەم جۆرە موسڵمانەکان بوونە سێ بەش. دوای ئەوەی دوژمن راونەرەکان گەڕانەوە، داوایانکرد دەسکەوتەکان هەمووی بۆ ئەوان بێت، چونکە ئەوان دوژمنیان شکاندوە. ئەوانەی کە لە دەوری پێغەمبەر (د.خ) مابوونەوە بە مافی خۆیان

دەزانی دەسکەوتەکان بۆ ئەوان بێت، لەبەر ئەوەی پێغەمبەریان لە مەترسی پاراستوە. کەچی ئەو بەشەی دەستیان بەسەر دەسکەوتەکان داگرتبوو سوربوون لەسەر ئەوەی کە خۆیان دەسکەوتەکانیان کۆکردۆتەوە، تەنیا ماف خۆیانە بیبەن. لە ئەنجامی ئەم مشتومڕە خەریك بوو کێشە لەنێوانیاندا دروست بێت . خودای گەورە بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە، ئایەتەی ئەنفالی دابەزاند.

## ئەنفال لە دیدی ئایینی ئیسلامەوە:

وەك لە بابەتی پێشو ئاماژەی پێکراوە، بۆ چارسەرکردنی ئەو کێشەیە کە لەنێوان شەڕکەرە موسڵمانەکان روویدا، لە دابەشکردنی دەسکەوتەکانی شەڕی بەدر، بۆیە دەتوانین دەربارەی ئەنفال لە روانگەی ئایینی ئیسلامەوە بەم شێوەیە رێکبخەین:

١. ئەنفال بە واتای ئەو دەسکەوتانە دێت، کە جەنگاوەرە موسڵمانەکان لە کاتی شەڕدا لەگەڵ بتپەرەستان و بێباوەڕان لە ماڵ و سامان و ئاژەڵ ودیلەکانی جەنگ دەستیان دەکەوێت.

٢. ئەو لایەنەی کە دەسکەوتەکانی لێدەگیرێت دەبێ کۆمەڵێکی بێباوەڕ و کافرین، لەلایەن ئەو موسڵمانانەی کە مەبەستیان لە شەڕکردن بۆ سەرخستنی ئایینی ئیسلام بووە، نەك کەسانی بێتاوان.

ئەگەر بەراوردێك لەنێوان ئەنفالی رژێم و بنەماکانی ئەنفال بکەین، بەهیچ شێوەیەك لەگەڵ یەکتری ناگونجێت، چونکە گەلی کورد گەلێکی موسڵمان و بڕوادارە. لە سەرەتای بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام بە ئارەزووی خۆیان بۆنەتە موسڵمان، تاکو ئێستا لە نەتەوە دەگمەنەکانن کە بەدروستی

پەیڕەوی ئایینی ئیسلام دەکەن، هەروەها کورد لەسەر خاك و ناو ماڵی خۆی هێرشی کراوەتە سەر، بە زەبری هێز تاڵان کراوە و لە گوندەکانیان ڕاپێچی شوێنە نادیارەکان کراون و زیندە بەچاڵ و گوللەباران کراون.

## ئەنفالی کورد:

وەك لە بابەتەکانی پێشو باسمانکرد، هەر لەسەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقیەوە کورد دووچاری پاکتاوکردنی نەژادی هاتووە، بەهەموو شێوەکانی گرتن و ڕاگواستن و کوشتن و تالانکردن و بەعەرەبکردن، بەڵام ئەمەی کە لەساڵی ١٩٨٨ بەناوی ئەنفال بەرامبەر گەلی کورد ئەنجامدرا، شێوەیەکی تایبەتی وەرگرت، لە دڕندایەتی و قڕکردندا، کە دەتوانین بەجۆرێکی ترسناکی جینۆسایدی لەم سەردەمەدا بە مرۆڤایەتی بناسێنین. کەواتە دەتوانین (ئەنفال) بەم شێوەیە پێناسە بکەین، کە ( میدل ئیست وۆچ)، دەیخاتە ڕوو: (**ئەنفال ئەو ناوەبوو کە بە زنجیرەیەك هێرش و پەلاماری نەخشە بۆ کێشراوی سەربازی ئەنجامدرا. سەرجەم هەشت پەلامار بوو لە شەش ناوچەی جوگرافیای جیاواز بەڕێوەچوو، لەنێوان مانگی شوبات و سەرەتای ئەیلولی ١٩٨٨ دا.** سەرەتا کردە سەربازییەکان لە دەست نوسینگەی باکووری ڕێکخستنی حیزبی بەعس بوو، کە بنکەی سەرەکی لە شاری کەرکوك بوو. لە ئاداری ١٩٨٧ بە دواوە لە لایەن (عەلی حەسەن ئەلمەجید) (عەلی کیمیاوی )، سەرۆکایەتی دەکرا. هێرش و پەلامارەکانی ئەنفال لەلایەن هێزە نیزامییەکان و هەردوو فەیلەقی یەك و پێنج ئەنجامدرا بە پاڵپشتی یەکە جیاوازەکانی سوپای عێراق و فەوجە سووکە کوردەکان(جاش).



ڕێوڕەسمی دووبارە ناشتنەوەی ئەنفالکراوانی گەرمیان

ئەنفال بەرچاوترین تاوانە لە دوای شەڕی دووەمی جیهانییەوە بە سەر گەلی کورد داهاتووە، بۆ لەناوبردن و سەرکوتکردنی بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد و سڕینەوەی هەموو مۆرکێکی نەتەوەیی و کولتوری و مێژوویی و دیمۆگرافی و کۆمەلأیەتی و ئابووری...هتد.

هێرشەکانی ئەنفال بە یەکێك لە زەقترین دیاردەکانی پێشێلکردنی مافی مرۆڤ لەلایەن رژێمی عێراقەوە دادەنرێت، کە پەلامارە سەربازییەکان راستەوخۆ گوندو لادێکان و چەند شارۆچکەیەکی کوردستانیان بە تەواوەتی وێرانکرد و ژمارەیەکی زۆری دانیشتوانە بێتاوانەکەیان بۆ چەند شوێنێکی تایبەت راگواستەوە، لە بیابانەکانی رۆژئاوای عێراق، لەسەر سنوری عێراق ـ سعودیە، کە زۆربەی هەرە زۆریان لەم ناوچەیەدا زیندەبەچاڵ و گوللەباران کران و ماڵ و سامانیشیان وەك دەسکەوتی شەڕ بە تاڵا بردرا.

دەسەڵاتدارانی رژێمی پێشووی عێراق زۆر بەشانازییەوە دانیان بە هێرشەکانی ئەنفال ناوە. هەموو ساڵێکیش یادیان کردۆتەوە، بەڵام هەرگیز دانیان بە بێسەروشوێن کردنی ئەو دەیان هەزار مرۆڤە بێتاوانە نەناوە. پیاوانی رژێم وایان بلاّودەکردەوە، کە گوایە شاڵاوەکانی ئەنفال تەنیا لە دژی (تێکدەران و بەکرێگیراوان) کراوە.

## هۆکارەکانی ئەنجامدانی شاڵاوەکانی ئەنفال:

هۆکاری ئەنجامدانی شاڵاوەکانی ئەنفال بۆ لەناوبردن و قڕکردنی گەلی کورد، ئەمانەی خوارەوەن:

**یەکەم:** گرنگی شوێنی جوگرافی هەرێمی کوردستان. ئەم شوێنە گرنگی تایبەتی جیۆپۆلەتیکی هەیە، کە بایەخ بە دوو بنەمای سەرەکی (**سروشتی و مرۆیی**) دەدات، لەئەنجامی لێکدانی هەردوو بنەما، بنەمای ئابووریش پەیدا دەبێت.

### أ. بنەمای سروشتی:

کوردستان بەسەر (٤) چوار دەوڵەتی ناوچەکەدا دابەشکراوە، ئەو دەوڵەتانەش هەمیشە لە ململانێی یەکتر دان. هەرچەندە شوێنی جوگرافی لەسەر زەوی نەگۆڕە، بەڵام لە رووی جیۆپۆلەتیکەوە لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمەکانی تر بەهۆی کاریگەری هۆکارە ئابووری و سیاسیەکان دەگۆڕێت، هەرێمی کوردستان کەوتۆتە نێوان هەر چوار دەوڵەتی (عێراق، ئێران، تورکیا، سوریا)، بۆیە وای لێهاتووە هەردەم کێشەکەی ئاڵۆزبێت و دەنگی رەوای گەلەکەی نەگاتە جیهانی دەرەوە. **هەرێمی کوردستان گرنگی زۆری هەیە، کە بریتین لە:**

١. ناوچەیەکی دەوڵەمەندە بە پترۆڵ و گازی سروشتی و سامانە کانزاییەکانی تر.
٢. زەوی بە پیت و سەرچاوەی ئاوی زۆر، وایکردووە ببێتە هەمە چەشنەی بەروبوومی کشتوکاڵی، کە دەتوانرێت بە سەبەتەی خۆراکی عێراق دابنرێت و کاریگەری لەسەر ئاسایشی خۆراکی هەموو عێراق هەبێت.

بایەخی جیۆپۆلەتیکی هەرێمی کوردستان، بە هۆکارێکی گرنگ و سەرەکی دادەنرێت بۆ ئەنجامدانی ئەم تاوانە، چونکە ئەگەر عێراق هەرێمی کوردستانی لێ جیابێتەوە، دەبێتە وڵاتێکی هەژار و کەم ئاو و کەم دەرامەتی سروشتی. کەواتە کوردستان مەرجی بەهێزبوونی دەوڵەتی عێراقە.

## ب. بنەمای مرۆیی:

ژمارەی دانیشتوان بایەخێکی زۆری هەیە لە پێوەری بەهێزی و لاوازی دەوڵەت لە **دیمۆگرافی** هەرێمی کوردستان، ئەگەر سەیری دانیشتوانەکەی بکەیت لە سەرژمێری گشتی عێراق، رێژەی لەدایکبوون، لەم هەرێمە زۆرترە بە بەراورد لەگەڵ ناوەڕاست و باشووری عێراق رێژەی مردنیش کەمترە، لەبەر کاریگەری ئاو و هەواکەی و تایبەتمەندی ژنی کورد کە بە وەچەترە(خصوبة). ئەمەشیان بە یەکێك لە هۆکارە گرنگەکانی دیمۆگرافی دادەنرێت بۆ گەلی کورد. هەر لەبەر ئەم هۆیەشە رژێمی عێراق لە رووی ئاسایشی نەتەوەییەوە بیری لێکردۆتەوە و نەخشەی داڕشتوە بۆ لەناوبردنی توێژی گەنجانی کورد، کە بە ئەنجامدانی شاڵاوەکانی ئەنفال بە هەزاران پیاو و ژنی گەنجی کورد لەناوبردران.

**دووەم:** تێکچوونی هاوسەنگی تەمەن لەنێوان گەنجانی کورد و گەنجانی ناوەڕاست و باشووری عێراق.

شەڕی درێژخایەنی نێوان عێراق و ئێران بووە هۆی لەناوبردنی هەزاران گەنج لە بەرەکانی شەڕدا، بەتایبەتی گەنجانی ناوەڕاست و باشووری عێراق، کە شوێنەواری خراپی ( ئابوری و کۆمەلآیەتی و سوپایی) لەسەر کۆمەڵگەی عێراقی هەبووە.

**سێیەم:** ناوچەیەکی زۆری کوردستان لەژێر دەسەلآتی هێزی پێشمەرگەی کوردستاندا بوو، بەتایبەتی ناوچە شاخاویە سەختەکان، کە بۆ بەرەنگاری و شەڕ لە بەرژەوەندی پێشمەرگە دابوو. حکومەتی عێراقیش بە مافێکی یاسایی خۆی دەزانی، کە دووبارە ئەم ناوچانە بخاتەوە ژێر دەسەلآتی خۆی، سوپای عێراقیش لەو کاتە سەرقاڵی بەرەکانی جەنگی ئێران بوو، نەیدەتوانی بە ئازادی ڕووبەڕووی ئێران ببێتەوە، لەبەر گورزی کوشندەی هێزی پێشمەرگە. بۆیە شالآوەکانی ئەنفال زیاتر گوندو لادێیەکانی کوردستانی گرتەوە، چونکە بە سەرچاوەی سەرەکی و بژێوی دانیشتوانەکەی و شوێنی داڵدەدانی هێزی پێشمەرگەی دەزانی.

**چوارەم:** لەسەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق، حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق نەتەوەی کوردیان وەك کۆسپ و ڕێگر لە بەردەم یەکێتی نەتەوەی عەرەب دادەنا. بە بیروبۆچوونی سیاسەتمەدارانی عێراق کێشەی کورد مەترسیە لەسەر ئاسایشی نەتەوەی عەرەب، بۆیە تا بۆیان کرابێت هەموو هەوڵێکیان داوە بۆ تواندنەوەو لەناوبردنی ئەم مەترسییە، شالاوەکانی

ئەنفالیش بە تۆڵەی هەوڵەکانی پاکتاوکردنی نەژادی گەلی کورد لە عێراق دادەنرێت.

**پێنجەم:** پەیوەندییە نێودەوڵەتی و هەرێمییەکانی عێراق.

حکومەتی عێراق لە ساڵانی هەشتاکانی سەدەی بیست، وڵاتێکی دابڕاو نەبوو لەرووی پەیوەندییە نێودەوڵەتی و هەرێمییەکان، بەڵکو پەیوەندییەکی توندوتۆڵی لەگەڵ وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامی و جیهانیدا هەبوو، بۆیە لە رووی سەربازی لە ماوەی جەنگی هەشت ساڵەی لەگەڵ ئێراندا ببوو بە وڵاتێکی بەهێز لە ناوچەکەدا. پاڵپشتی دەرەوە و جیهان وای لە حکومەتی عێراق کردبوو، کە گوێ بەهیچ یاسا و بڕیارێکی نێودەوڵەتی نەدات لە پیادەکردنی سیاسەتێکی وێرانکارانە دژی ناوچەکانی کوردستان. بۆنمونە، کاتێ حکومەتی عێراق بەوپەڕی فراوانی و خەستی چەکی کیمیاوی لە شاڵاوەکانی ئەنفال بەکاردەهێنا، حکومەتی سۆڤیەت داکۆکی لە هەڵوێستی عێراق دەکرد. جگە لەمەش حکومەتی تورکیا رۆڵێکی گرنگی دەگێڕا لەم بارەیەوە، وتەبێژی وەزارەتی دەرەوەی تورکیا رایگەیاند، کە شارەزایانی پزیشکی تورکیا پەناهەندە کوردەکانیان پشکنیوە، هیچ جۆرە شوێنەواری چەکی کیمیاویان بەسەرەوە دیار نەبووە، هەروەها بە داواکاری نەتەوە یەکگرتووەکان رازی نەبوو، بۆ ناردنی پسپۆرانی تەندروستی بۆ پشکنینی پەناهەندە کوردکان.

**شەشەم:** نالەباری بارودۆخی کورد، کورد لەم قۆناغەدا زۆر بێکەس بوو، هیچ هێز و وڵاتێك نەبوو پشتگیری و داکۆکی لە مافەکانی بکات و فشار بخاتە سەر حکومەتی عێراق بەرامبەر بەو هەموو پێشێلکارییە نامرۆڤانەی پەیڕەو

دەكرا لە پاكتاوی رەگەزی دژی گەلی كورد، بەتايبەتی لە ساڵی ١٩٨٨ كە هەموو ناوچەكانی كوردستانی گرتەوە.



كۆكردنەوەی ژن و منداڵی كورد لە شاڵاوەكانی ئەنفال و رەوانەكردنیان بەرەو مەرگ




نەخشەی ژمارە (٥) ناوچە ئەنفالكراوەكانی هەرێمی كوردستان *

---

* لە نەخشەكانی سەردار محمد عبدالرحمن / ئەتڵەسی هەرێمی كوردستانی عێراق .

# شالأوەکانی ئەنفال

## ١. جوگرافیای شالأوەکانی ئەنفال:

وەك لەپێشەوە ئاماژەمان بۆکرد، سەرانی رژێمی عێراق هەر لەسەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقدا، بەردەوام بوون لەسەر سیاسەتی پاکتاوکردنی رەگەزی کورد، چونکە لە هزری ناسیۆنالیستیاندا، کورد مەترسی بوو لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی عەرەب، بۆیە رۆژ لەدوای رۆژ تاوانەکانیان گەورەتر دەبوون و زیانەکانی گەلی کوردیش بەهەمان شێوە گەورەتر دەبوو، تاکو ساڵی ١٩٨٨ رژێم بێ پەروا هەرچی هێز وتوانا و تەکنۆلۆجیا و پەیوەندیە نێودەوڵەتییەکانی بە دەستەوە بوو بەرامبەر گەلی کورد بەکاریهێنا، ئەم جارەیان لەژێر ناوی (ئەنفال). تاوانەکانیش بەچەند قۆناغێك دەستیپێکرد بریتین لە:

**ئەنفالی یەك: ئەنفالی دۆڵی جافایەتی، لە (٢٣ی شوبات تاكو ١٩ئاداری ١٩٨٨ی خایاند)** ئەم شالأوە بە هێرشکردن بۆ سەر گوندەکانی سەرگەڵو و بەرگەڵوی دۆڵی جافایەتی لە ٢٣ شوباتی ١٩٨٨ دەستیپێکرد. لە چەند قۆڵێکەوە بەدرێژایی (٨٠)کم لە بنگردەوە بۆ لای رۆژهەڵاتی دەریاچەی دوکان و شارۆچکەی دوکان، لەوێشەوە بۆ شاری سلێمانی و شارۆچکەی ماوەت و چوارتای گرتەوە. ئامانجی ئەم هێرشە لەناوبردن و وێرانکردنی (٢٥ –٣٠) گوندی دۆڵی جافایەتی و داگیرکردنی بارەگاکانی سەرکردایەتی هێزی پێشمەرگە بوو لەم ناوچەیەدا. ئەم هێرشە بەربلأوە سنوری شارۆچکەکانی (سورداش، دوکان، بنگرد، سەرچنار، قەڵاچوالأن و چوارتا)ی گرتەوە. بەسەر پەرشتی وەزیری بەرگری (سوڵتان هاشم) بوو. هێزە بەشدار بووەکانی ئەم

شالأوه پێكهاتبوون له (٢٠) لیواو شەست فەوج و دەیان فەوجی جاشی سوك و مەفرەزە تایبەتەكان، بە نوێترین چەكی قورس و بەخەستی چەكی كیمیاوی لەم هێرشەدا بەكارهات. لەئەنجامدا چەندین گوندو ناوچە وێرانكران. بۆنمونە( قەمچۆغە، شاخەڕەش، دۆڵە ڕووت، قزلەر، قەرەسەرد، ئاسۆس، قەرەچەتان، شەدەڵە ، پیرمەگرون، زێوێ، گەڕەدێ، دابان، مەرگەو شارستێن )، هەروەها كانی توو، یاخسەمەڕ ، قەیوان ...هتد. بەشێوەیەك هیچ گوندێكی ئەم دەڤەرە رزگاری نەبوو. لە كۆتایی شالأوەكەدا سەرجەم ناوچەكە داگیركرا و گشت گوندەكان روخێنران و وێرانكران و ماڵ و سامانیشیان لەلایەن سوپای عێراقەوە بەتالأن بردرا. كاتی گوندەكان داگیركران، دانیشتوانی ناوچەكە بەرەو ئێران هەلأتن، هەندێكیش بەرەو سلێمانی چوون، بۆیە گوندنشینانی دۆڵی جافایەتی بەشێكی زۆریان دەرباز بوون. بەلأم ئەوانەی بەرەو ئێران رایانكرد بە هۆی سەرما و بەفر و باران زۆریان لە رێگادا مردن. ئەو خەڵكەی كە دەرباز نەبوون و مابوونەوە هەموویان گیران و شونبزركران.

### ئەنفالی دوو: له (٢٢ی ئادار تاكو ١ نیسانی ١٩٨٨ كۆتایی هات)

ئەم هێرشە ناوچەی قەرەداغی گرتەوە لە(تەكیە،سێوسێنان،سەگرمە، دەربەندباسەرە، قۆپی قەرەداغ...هتد). گشت گوند و ئاوەدانییەكانی ئەم ناوچە جوگرافیایەی گرتەوە. سەرەتای هێرشەكە بە كیمیابارانكردنی چەند شوێنێكی ستراتیژی له ناوچەكە دەستپێكرد، بۆیە گوندی سیوسێنان كە گوندێكی دیاری ناوچەكە بوو بە شێوەیەكی زۆر سەخت كیمیابارانكرا. مەبەست لەم كردە روخاندنی ورەی خەڵكی ناوچەكە بوو. لەكاتی هێرشەكە

دانیشتوانی ناوچەی قەرەداغ بە دوولا رایانکرد، هەندێکیان بەرەو سلێمانی و ئۆردوگاکانی ناوچەی سلێمانی چوون، زیانیان کەم بوو، بەڵام ئەو کۆمەڵەی بەرەو خوارووی گەرمیان رایانکرد ژمارەیەکی زۆریان دەسگیرکران و دواتر شونبزرکران.

لە ئەنفالی قەرەداغ ئەو هاوولاتیە کوردانەی کە گیران یا خۆیان دا بەدەستەوە، بۆ سەربازگەی قۆڕەتوویان گواستنەوە، کە نزیکەی هەشت هەزار کەس دەبوون لە ژن و منداڵ وپیر و گەنج، پاشان گواسترانەوە بۆ سەربازگەی تۆبزاوە نزیك کەرکوك. ئینجا لەوێ گەنجەکانیان لەوانی تر جیاکردەوە و بەرەو شوێنی نادیار رەوانەکران، خەڵکەکەی تر لە ژن و منداڵ و کچی عازەب خرانە زیندانەوە بەڵام پیرەژن و پیرەمێردەکان بۆ (نوگرەسەلمان)ی بیابانی سەماوە گواسترانەوە، کە لەوێ ژمارەیەکی یەکجار زۆریان لە برسان و تێنویەتی و نەخۆشی مردن و تەرمەکانیان فرێدەدرایە دەرەوەی زیندانەکە، سەگ دەیخواردن.




مۆنۆمێنتی ئەنفال لە گەرمیان

## ئەنفالی سێ: لە (٧ تا ٢٠ نیسانی ١٩٨٨)

شالآوی ئەنفالی سێ کە ناوچەی گەرمیانی گرتەوە، گەورەترین و بەرفراوانترین هێرش و پەلامار بوو لە ساڵی ١٩٨٨ بۆسەر کوردستان، کە ناوچەکانی (دوز، قادرکەرەم، کەلار ، کفری، چەمچەماڵ، تێلەکۆ،پێباز، سەنگاو،تەکیە و بەشێك لە ناوچەی ئاغجەلەر)ی راماڵی. زیانێکی ئێجگار گەورەی گیانی و ماڵی بە دانیشتوانی نزیکەی (٥٠٠) پێنج سەد گوندی ئەم ناوچەیە گەیاند، کە پتر لە سی هەزار ژن و منداڵ و پیر و گەنجی بێسەروشوێن کرد و ماڵ و سامانیشیان بەتالآن بردرا.

لە (١٤ نیسانی ١٩٨٨)دا، چوار شارۆچکەی گەرمیان بە یەك رۆژ بە تەواوەتی وێرانکران و نزیکەی بیست هەزار ژن و منداڵ و پیاوی بۆ سەربازگەی قۆرەتوو رەوانەکران، بۆیە ئەم رۆژە لە هەموو ساڵێك کراوەتە رۆژی یادکردنەوەی تاوانە گەورەکەی ئەنفال لە کوردستان.

هۆی زۆری ژمارەی گیراو و شونبزر کراوەکانی گەرمیان، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە کە پارێزگای سلێمانی بەهۆی قائیمقامیەتی چەمچەماڵ بەرێگای مستەشارە کوردەکانەوە پرۆپاگەندەیان بلاوکردەوە، کە حکومەت هەر خێزانێك (٣٠٠) مەتر دوجا زەوی لەگەڵ قەرزی عەقاری دەداتە گوندنشینەکان. ئەمەش وایکرد، کە خەڵکەکە هێمن ببنەوە و رانەکەن، بۆیە ئەو ژمارە زۆرە دەسگیرکران.

دەسگیرکراوەکانی ئەم مەڵبەندە بەرەو چەمچەماڵ رەوانەکران، کە بووە مەڵبەندی کۆکردنەوەی گیراوەکانی باکووری گەرمیان، ئەوانەی لە کەمپەکانی قادرکەرەم و لەیلان بوون بۆ ئەوێ دەهێنران.



وێرانکردنی گوندەکانی کوردستان لە کاتی ئەنفال

بەلاّم گیراوەکانی باشووری گەرمیان لە دوو مەڵبەندی سەرەکی کۆکرانەوە، یەکێکیان مەڵبەندی لاوانی دوزخورماتو بوو، کە نزیکەی چوار هەزار کەسی تێدا بەندکرابوو، سەربازەکانیش زۆر نامرۆڤانە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکردن، سەرەڕای ئەشکەنجەدان و برسیکردن و تێنوکردن، هەرچی پارە و زێڕو شتی بەنرخیان پێبوو لە ئافرەتەکانیان دەستاند، پێیان دەوتن ئێوە یارمەتی (موخەڕیبتان) داوە (پێشمەرگە). بەلاّم مەڵبەندی دووەم بۆ کۆکردنەوەی گیراوەکان، بارەگای فیرقەی (٢١) بوو لە قۆڕەتوو. لە زاری یەکێك لە دەربازبووەکانەوە هاتووە، کە نزیکەی دە هەزار کەس لەم قەلاّ سەربازییە بەندکرابوون.

بەپێی چاوپێکەوتنەکانی (MEW میدلّ وێست وۆچ)، لەگەڵ یەکێك لە رزگاربووان، ژن و پیاو لەیەکتر جیاکراونەتەوە، ئینجا پیاوەکان بۆ شوێنێکی نادیار گواستراونەتەوە و دواتریش بەهەمان شێوە ژن و منداڵەکانیشیان جیاکردۆتەوە.

**ئەنفالی چوار: ئاوگەی زێی بچووك (لە ٨ی نیسان تاوەکو ٣ ئایاری ١٩٨٨).**

هێزەکانی رژێم دوای تـەواوکردنی تاوانـەکانی ئـەنفالی سـێ، کـە زۆرتـرین ژمارەی قوربانی و شونبزری لێکەوتەوە. لە هێرشەکانی بەردەوامبوو بۆسـەر ناوچەکانی تری کوردستان بەهەمان شێوە.

جوگرافیای ئەم شاڵاوە ئاوگەی زێی بچوك بوو، کـە هێڵـی سـنووری هـەر دوو پارێزگای کەرکوك و هەولێر پێکدەهێنێت. ئەم ئاوگەیە شارۆچکەکانی (رێدار، ئاغجەلـەر، تەقتـەق و چـەند گونـدێکی گـەورەی وەك عەسـکەر و گۆپتەپـە دەگرێتەوە)، کە دەتوانین بلـێین سـنووری ئـەم شـاڵاوە ناوچـەکانی دەشـتی کۆیە و تـەقتـەق و شـێخ بـزێنی و ناوشـوان و ئاغجەلـەر و خاڵخـاڵان و چـەمی رێزانی گرتەوە.

سەرەتای ئەنفالی چوار بە کیمیابارانی گوندی گۆپتەپە لە رۆژی ٣ ی ئایـاری ١٩٨٨ دەسـتپێکرد بـەهۆی فرۆکـە جەنگیـەکان بـۆمبی کیمیـاوی بەسـەر خەڵکەکـەی دابارانـد. قوربانییـەکانی ئـەم گونـدە بـە نزیکـەی (٣٠٠) کـەس دەخـەملێنرێت، هاوکـات گونـدی عەسـکەری بـە هەشـت بـۆمبی کیمیـاوی بۆردومانکرد، بۆنی کیمیاوییەکە تەشەنەیکرد تاکو گەیشـتە گونـدی حەیـدەر بەگ، لەوێش ژمارەیەك قوربانی لێکەوتەوە.

بۆ رێگـرتن لـە دەربـازبوونی دانیشـتوانی گونـدەکانی گۆپتەپـە و عەسـکەر و حەیدەر بەگ، رژێم ئاوی بەنداوی دوکانی بەردایەوە، تاکو نەتوانن لە زێیەکە بپەڕنەوە و رزگار ببن. خەڵکەکـە بـەرەو ناوچـەکانی چەمچـەماڵ و تەکییـە و هەندێکیشـیان بـەدەم زێیەکـە شـۆڕبوونەوە بـەرەو ناوچـەی شـێخ بـزێنی. هـەڵاتوەکانی گونـدی عەسـکەر لەسـەر جـادەی سـەرەکی لەلایـەن سـوپاو

جاشـەوە دەسـگیرکران و رەوانـەی کۆمەڵگـەی سوسـێ کـران. بـەم جـۆرە زۆربەی خەڵکی ناوچەکە، کە لەدەست سوپا رزگاریان نـەبوو و شـونبزرکران. لە ٤ ئایار هێرشەکە فراوانتر بوو بەشـێوەیەك ناوچـەکانی دەوروبـەری شـاری کۆیە و گوندەکانی لێواری زێ و دەوروبەری شارۆچـکەی تەقتـەق و ناوچـەی شـێخ بـزێنی گرتـەوە. بەدرێـژایی زێـی بچـووك سـوپا گونـدەکانی ئەمبـەر و ئەوبەری وێرانکردو سوتاندنی. ژمارەی شونبزرکراوانی ئەم ناوچـەیە گەیشـتە (١٦٨٠) هەزارو شەش سەد و هەشتا کـەس. بـەم شـێوەیە، درندایـەتی رژێـم هەموو گوند و ناوچەکەی گرتەوە، کـە(٢٣٧) دووسـەدو سـی و حـەوت گونـد تەخت و ویرانکران و سوتێنران، نزیکەی (٢٥٠٠) دووهەزارو پێنج سەدو کەس لە دەشـتی کۆیـە و (٣٠٠٠) سـێ هـەزار کـەس لـە ناوچـەکانی شـێخ بـزینی و ناوشوان شونبزرکران. لەم شاڵاوەدا هەمان سیاسەتی ئەنفالەکانی تر پـەیرەو دەکرا بۆ کۆکردنەوەی خەڵکە گیراوەکە، کـە چـەند شـوێنیان ئامـادەکرد بـۆ کۆکردنەوە و جیاکردنەوەی خەڵکەکە و راگواستنیان بۆ شوێنی نادیار.

**قۆناغی (ئەنفالی ٥، ٦، ٧) دۆڵی جیاکانی شـەقڵاوە و رەوانـدوز لـە ١٥ ئـایار. ٢٦ ی ئابی ١٩٨٨):**

سـەرەتای هێرشـەکە لـە ١٥ ئایـاری ١٩٨٨ بـوو، کـە دوا رۆژی مـانگی رەمەزان بوو. چەند فرۆکەیەك کەوتنـە کیمیابـارانکردنی گونـدەکانی ( وەرە، نـازەنین، کاموسـەك، ئەسـپیندارە، عـەلیاوە، سمـاقولی)، بـووە هـۆی گیـان لەدەسـتدانی ژمارەیـەکی زۆری دانیشـتوانی گونـدەکان و مرداربـوونی ئاژەڵەکانیان. توندترین هێرشی سوپای عێراق بۆ ناوچەی دۆڵی بالیسان بوو، بەڵام زیانی گیـانی بـە بـەراورد لەگـەڵ هێرشـەکانی پێشـوو زۆر کـەمتر بـوو،

چونکە زۆربەی ناوچە سنووریەکانی پارێزگای هەولێر لە سالآنی (١٩٧٧ ــ ١٩٧٨) و (١٩٨٣ ــ ١٩٨٤) چۆڵ کرابوون و خەڵکەکەی راگوێزرابوونەوە کۆمەڵگا زۆرەملێیەکان، بەلآم هەندێ گوند مابوو، بەتایبەتی گوندە ئازادکراوەکانی ناوچە سەختەکان، کە سوپای عێراق دەستی پێیان نەدەگەیشت، بەهۆی بەرگری پێشمەرگە و سەختی ناوچەکە. لە ٢٣ ئایار گوندەکانی بالیسان و هیران و دۆڵەکانی دەوروبەری چەند جار بەخەستی کیمیابارانکران و ٢٢ ــ ٢٣ ی هەمان مانگ گوندی وەرتێ کیمیابارانکرا. قۆڵێکی تر لە سەروچاوە و بەنی هەریر و خەلیفان بەشێوەی بازنەیی بوو، نزیکەی (٧٢٠) حەفت سەدو بیست خێزانی دەربەدەرکرد وماڵیشیان تالآنکرا. گەورەترین زیان لەم ناوچەیە بەر گوندی بلەی خواروو کەوت، خەڵکەکەی شونبزرکران لەچاو گوندەکانی تر، هەروەك گیراوەکانی تر بەرەو تۆبزاوەی کەرکوك رەوانەکران و لەوێشەوە ژن و پیاو و گەنج لێك جیاکرانەوە و گەنجەکان بزرکران. لە رۆژی ٧ی حوزەیران شالآوی ئەنفالی پێنج کۆتایی هات.

سەرەتای **ئەنفالی شەش** لە ٢٦ ی تەمووز بە بۆردومانکردنی ناوچەکانی دۆڵی بالیسان و دۆڵی مەلەکان و دۆڵی وەرتێ ودۆڵی هیران و سماقولی بە چەکی کیمیاوی دەستیپێکرد و خەڵکەکەی دەرپەڕاند، پاشان لەلایەن جاشەکانەوە ناوچەکە داگیرکرا، داواشیان لە خەڵك کرد خۆیان بەدەستەوە بدەن لێبوردنی گشتی هەیە، بۆیە ژمارەیەکی زۆری خەڵکەکە هەڵخەڵەتان، خۆیان دا بەدەستەوە، ئاگاداری خەڵکەکە کرایەوە ئەگەر چەکیان پێبێت دەبەخشرێن، بۆیە خەڵکەکە بەدوای ئەو چەکانە دەگەڕان، کە پێشمەرگە لە

ناوچەکە شاردبویانەوە، پاشان دان پێدانانیان پێ مۆرکردن کە پێشمەرگەن، لە دواییدا هەموویان شونبزرکران.

لەمیانــەی شــالأوەکانی ئــەنفالی (٥، ٦، ٧)، (٥٢) پــەنجا و دوو گونــد، لــە ناحیەی خەلیفان و رەواندوز و خۆشناو وێرانکران، کە سەرجەم خێزانەکانیان (٢٦٠٢) بوو، هەروەها ٢٤ قوتابخانە و ٥٢ مزگەزت، جگە لـە کوێرکردنـەوەی ســەدان کــانی و جۆگــە و ســوتاندنی رەز و بــاخی ناوچــەکە، کــە ژێرخــانی ئابووری پێکدەهێنا، رەگوریشەی بژێوی خەڵکی ناوچەکەی لە بنرِا هەڵتەکاند و سامانیشیان بەتالآن بردرا.

## ئەنفالی کۆتایی (بادینان ) لە ٢٥ئاب ـ ٦ ئەیلولی ١٩٨٨:

لەدوای وەستانی شەڕی عێـراق ـ ئێـران، دوا شـالأوەکانی ئـەنفال لـە ٨ی ئـابی ١٩٨٨دەسـتپێکرد، سـوپای عێـراق دەسـتی والأبـوو بـۆ ئـەنفالکردنی ناوچەی بادینان. ئەم شالأوە بە درێژایی ناوچەکانی ( زاخۆ، ئامێدی، شێخان و ئاکرێی گرتەوە). هـەروەك پیشـەی جـارانی لـە شـالأوەکانی تـری ئـەنفال، یەکەمجار شوێنە ستراتیژیەکانی ناوچەکەی بۆردومانکرد بە بۆمبی هێشـوویی ( عنقودی) و کیمیاوی.

خەسترین هێرشی هێشوویی لە ٢٤ی ئاب بۆ سەر گوندی سپینداری قەد پاڵی چیای گارە بوو، رۆژی دواتر ئەم ناوچەیە بەر خەسـترین هێرشـی کیمیابـاران کەوت، شالأوەکە گوندەکانی چیای گارەی بە درێـژایی (٣٠کـم )گرتـەوە، کـە نزیکـەی پـەنجا گونـد دەبـوو، لـەلای بـاکوور گونـدەکانی (دهـۆکی، باوەرِکـا کەڤرِی، مێزێ، سپیندار...هتد). لە سەر چیای گارەش گوندەکانی (گارەگۆ، زێوەشکان، زارکێ، سارتکێ...هتد). لەلای باشوور (سـوارێ، ئـاڤۆك و چـەند

گونـدێکی تـر). لـه بەرەبـەیانی٢٥ ئـاب فرۆکـه جەنگییـەکان کیمیابـارانی گوندەکانی برجینی ناحیەی زاوێته و ئەوبەری زێی خابور و هێسی و خـەرابیا و یەکمالەی بـەرواری ژێـری کیمیابـارانکرد. ئەگـەر بـەراوردێك لـەنێوان چـڕی بۆردومانەکـەو ژمـارەی قوربانیـان بکـەین، بۆمـان دەردەکـەوێت کاریگـەری کیمیابارانەکـه کـەمترە، هۆیەکـەش بـۆ ئـەوە دەگەڕێتـەوە، کـه پێشـمەرگه توانیان پێشتر ئامۆژگـاری و ڕێنمـایی خۆپاراسـتن بڵاوبکەنـەوە، بـەڵام مـەڕو ماڵات و ئاژەڵی گوندەکان قڕیان تێکەوت و کێڵگەکانیش لە بەرهەم کەوتن.



له دوای ئەنفال بەرەو ئێران ڕێدەکەن

**ئەنفالی کۆتایی (بادینان )بە دوو خاسیەت لە شاڵاوەکانی تر جیادەکرێتەوە (ناوچەکانی قەرەداغ و گەرمیان و ئاوگەی زێی بچوک و دۆڵی شەقڵاوە و رەواندوز ) لەبەر چەند هۆیەك:**

١. هەندێ لە خێلەکانی ناوچەکە پەیوەندی باشیان لەگەڵ رژێمی عێراقدا هەبوو، کە بووە هۆی پاراستنی خۆیان لە کوشتن و تاڵانکردن و وێرانکردنی گوندەکانیان.

٢. جیۆپۆلەتیکی ناوچەکە. لەبەر ئەوەی ئەم ناوچەیە هاوسنووری تورکیایە و لەسەر سنووری نێودەولەتیە، دیارە رژێمی عێراقیش ویستویەتی بە ئەسپایی و بەنهێنی کۆمەڵکوژیەکە لەم ناوچەیە ئەنجام بدات، چونکە تورکیا هاوسنووری وڵاتانی ئەورووپایە، لەوانەیە رێکخراوەکانی ماف مرۆڤ و رۆژنامەنوسانی بیانی بگەنە ناوچەکە و تاوانەکە ئاشکرابێت و حکومەتی عێراق توشی سزابکات، یاخود وڵاتانی ئەورووپا لەژێر فشاری رای گشتی چاو بە پەیوەندیەکانیان لەگەڵ عێراقدا بخشێننەوە.

لە ٢٨ ئاب هێرشی زەمینی دەستپێکرد، لە ئەنجامدا دەیان هەزار لە دانیشتوانی ناوچەکە ئاوارەی تورکیا و ئێران بوون و ژمارەیەکیش دەسگیرکران. هەندێکیشیان دواتر بەناچاری لە لێبوردنەکەی ٦ی ئەیلولی ١٩٨٨ خۆیان دا بەدەستەوە. لە ئێوارەی ٢٩ ئاب بە هەزاران کەسی ناوچەکانی زێبار و بەری گارە لەسەر (رووێ شین) لە هەموو لایەکەوە گەمارۆدران، خەڵکە گیراوەکە گواسترانەوە بۆ دوو مەڵبەندی کۆکردنەوە، بەشێکیان کە گەنجەکان بوون، لە قەلای نزارکێی دهۆك کۆکرانەوە، کە وەك تۆبزاوەی کەرکوك وابوو. ژن و منداڵەکانیش بۆ بەندیخانەی سەلامیەی موسڵ گواسترانەوە.



خۆ ئامادەکردن بۆ کۆچ لە دوای ئەنفال

سەرجەمی گوندە وێرانکراوەکانی شاڵاوی ئەنفالی کۆتایی بەپێی زانیارەکان (٤٥٠) چوار سەد و پەنجا گوند بوو. زیانە گیانیەکانی ئەنفالی بادینان بە نزیکەی سی و دوو هەزار کەس دەخەملێنرێت، گولەباران و شونبزرکران، زیاتر لە سەد هەزار کەسیش ئاوارەو دەربەدەری تورکیاو ئێران بوون، ئەوانی تریش گواسترانەوە بۆ کۆمەڵگاکانی جەژنیکان لە نزیك هەولێر.

ئەو ئاوارانەی کە بەرەو تورکیا رایانکرد، سەرەتا حکومەتی تورکیا رازی نەبوو پەنایان بدات. ئەوانەی سنووری تورکیاشیان بەزاند هەندێکیانی رادەستی حکومەتی عێراق کردەوە، رێگەشی بە رێکخراوە مرۆیی و رۆژنامەنوسان نەدا سەردانیان بکەن، تا بۆیان ئاشکرابێت، ئایا چەکی کیمیاوی لە دژیان بەکارهاتووە یا نا. لە مانگی پێنجی ساڵی ١٩٨٩ (٣٠٣٤) سی هەزار و سی و چوار کەس لە ئۆردوگایەکی تورکیا، بەهۆی نان ژەهراوی

بوون، ئەم کارەش بە هاوبەشی لەنێوان پیاوانی رژێمی عێراق و کاربەدەستانی تورکیا ئەنجامدرا.

رژێم هەر بە ئەنفالکردنی کورد لەم دەڤەرەدا نەوەستا، بەڵکو هێرشەکە **گوندنشینە مەسیحیەکانیشی** گرتەوە، دوای بۆردومانکردن و سوتاندن و وێرانکردنی گوندەکانیان، دانیشتوانەکەی ئەوەی رایکرد، ئەویتر دەسگیرکران و خرانە مەڵبەندی کۆکردنەوەی ئەنفال لە بەندیخانەی سەلامیەی موسڵ، ژمارەیەکیشیان کە بەپێی زانیاریەکان (١٥٢) سەد و پەنجاو دوو کەس بوون گوللەبارانکران، کە زۆربەیان خەڵکی گوندەکانی (مێزێ لە سەرسەنگ و گوندە کۆسە لە دۆسکی و کانی بەلاڤ لە بەرواری باڵاو گوندی باش و گوندی قارولە لە نێروا و دەرکش لە ئامێدی بوون).

لەم تاوانە گەورانەی ئەنفال بۆسەر کوردستان بەگشتی و دەڤەری بادینان بەتایبەتی، نابێ رۆڵی فەوجەکانی بەرگری نیشتمانی (جاشە کوردەکان) لەبیر بکەین، کە یارمەتی باشی سوپایانداوە و لە هەندێ ناوچەش پێشڕەوی سوپای رژێمیان کردوە، چونکە شارەزای ناوچەکە بوون و رۆڵێکی بەرچاویان هەبووە، لە تاڵانکردنی ماڵ و سامانی گوندە ئەنفالکراوەکان و دەسگیرکردنی ئەم خەڵکە سڤیلەی لە ترسی سوپای رژێم رایاندەکرد بۆ ئەوەی خۆیان رزگاربکەن.

## ئەنجامەکانی ئەنفال و کاریگەری لەسەر کوردستان:

بەڵگە نەویستە سیاسەتی رژێمی بەعس، هەر لەگەڵ وەرگرتنی دەسەڵات، لە ساڵی ١٩٦٨ ئامانجی سڕینەوەی گەلی کورد بووە لە عێراق، بۆ بەجێهێنانی پلانەکانی، یەکێك لە دامزرێنەرەکانی حیزبی بەعس (میشێل عەفلەق) دەڵێت: (کورد لە عێراق و سوریا، بەربەر لە رۆژئاوای نیشتمانی عەرەب، کۆسپن بۆ دروستبوونی یەکێتی نیشتمانی عەرەب، بۆیە دەبێت لەناوببردرێن).

بۆ جێبەجێکردنی ئەم دەستەواژە چەندان بەرنامە و پیلانیان ناوەتەوە بۆ لەناوبردنی گەلی کورد، هەروەك ( عەلی حەسەن ئەلمەجید) دووپاتی دەکاتەوەو دەڵێت: (تەنیا رێگا بۆ ئازادکرنی خێزانە بەندکراوەکان و گیراوەکان، زیندە بەچاڵکردنیانە).

سیاسەتی جینۆسایدی کورد، بەبەردەوامی پەیرەو کراوە، بەڵام لە ساڵی ١٩٨٨ گەیشتە لوتکە و بەوپەڕی دڕندایەتی، کە کاریگەری و شوێنەواری لەسەر کۆمەڵگەی کوردی جێهێشتوە، کە تاکو ئێستا تاکی کورد پێیەوە دەناڵێنێت، بۆیە دەتوانین **ئەنجام و کاریگەریەکانی ئەنفال بەم شێوەی خوارەوە ریزبەند بکەین:**

١. وێرانکردنی زۆربەی گوندەکانی کوردستان، کە ژمارەیان بە زیاتر لە (٤٥٠٠)چوار هەزار و پێنج سەد گوند دەخەملێنرێت، لە هەموو شوێنەوارێکی بەردەوامبوونی ژیان سڕانەوە.

٢. شونبزکردن و لەناوبردنی نزیکەی دووسەد هەزار مرۆڤی کورد.

٣. داتەپاندنی ژێرخانی ئابووری کوردستان، لە رێگای وێرانکردنی گوندەکان و کێڵگە کشتوکاڵیەکان، کە بووە هۆی لەناوبردنی رێژەی هەرە زۆری سامانی

ئـاژەڵی ناوچـەکانی کوردسـتان، لەگـەڵ بـەتاڵان بردنـی مـاڵ و سـامانی گوندنشینەکان.

٤. تێکدان و تەختکردنی شوێنە مێژوویی و پەرستگاکان ( مزگەوت و کلێسـە) و ناوەندەکانی خوێندن و تەندروستی.

٥. پـەیڕەوکردنی سیاسـەتی زەوی سـوتاندن، بـەکیمیاباران و ژاراویکردنـی سەرچاوەکانی ئاو، بۆ سڕینەوەی هەموو شێوەیەکی ژیان لەم ناوچانەدا.

٦. بـە لـەناوبردنی بنـەماکانی ژیـانی گوندنشـینەکان و نیشـتەجێکردنیان لـە کۆمـەڵگا زۆرەملێیـەکان و گـۆڕینی تـاکی کـوردی لـە بەرهەمێنـەوە بـۆ بەکاربـەر، کـاری کـردە سـەر دابەزانـدنی ئاسـتی بـژێوی دانیشـتوانە رزگـار بووەکە.

٧. هەڵوەشاندنەوەی شیرازەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەی کوردی و بڵاوبوونـەوەی هەنـدێ دیـاردەی ناشایسـتە، کـە پێچـەوانەی داب و نـەریت و بـەها کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگەی کوردی بوو.



مۆنۆمێنتی شەهید لە هەولێر

## پرسیارەکانی بەشی پێنجەم

**پ١. ئەم زاراوانە پێناسە بکە :**

ئەنفال، سەربازگەی تۆبزاوە، نوگرەسەلمان، کۆمەڵگەی سوسێ، بۆمبی هێشوویی، بەندیخانەی سەلامیە، فەوجەکانی بەرگری نیشتمانی، کۆمەڵگاکانی جەژنیکان، گوندی بلەی خوارو. سێوسێنان .

**پ٢.هۆی ئەمانە لێك بدەرەوە :**

١. رۆژی (١٤ نیسانی ١٩٨٨) لە هەموو ساڵێك کراوەتە رۆژی یادکردنەوەی تاوانە گەورەکەی ئەنفال لە کوردستان .

٢. ژمارەی گیراو و شونبزر کراوەکانی گەرمیان لە هەموو شاڵاوەکانی تر زیاتر بوو.

٣. ئەگەر بەراوردێك لە نێوانی چڕی بۆردومانی کیمیاوی و ژمارەی قوربانیانی دەڤەری بادینان بکەین، بۆمان دەردەکەوێت کاریگری کیمیابارانەکە کەمترە.

٤. هێزەکانی رژێم لە شاڵاوەکانی ئەنفالی سێ ئاوی بەنداوی دوکانی بەردایەوە.

**پ٣. ئەنجام و کاریگەریەکانی ئەنفال بۆ سەر کۆمەڵگەی کوردی چییە؟**

**پ٤. کوردستان مەرجی بە هێزبوونی دەوڵەتی عێراقە . ئەم دەستە واژەیە شیبکەوە.**

**پ٥.ئەگەر لە رێورەسمی دووبارە ناشتنەوەی قوربانیانی ئەنفال لە ناوچەکەی خۆت ئامادە بوویت، هەستت بە چی دەکرد، ئەو هەستەت بۆ هاورێکانت رونبکەوە.**

**پ٦. چۆن ئەنفال لە روانگەی ئاینی ئیسلامەوە شیدەکەیەوە؟**

# بەشی شەشەم
## جینۆساید

### زاراوەی جینۆساید:

جینۆسـاید زاراوەیەکـە لـە دوو برگـە پێکهـاتووە، جینـۆ (Genos) وشـەیەکی گریکیـە بـەواتای رەگـەز یـا بنەچـە دێـت، (caeder) وشـەیەکی لاتینییـە بـەواتای لـەناوبردن و پاکتـاوکردن دێـت، هـەردوو وشـەکە پێکـەوە بەمانای پاکتاوی رەگەزی دێت.

بـەکارهێنانی زاراوەی جینۆسـاید بـۆ یەکـەمجار لەلایـەن شـارەزای یاسـایی پۆڵەنـدی (رافائیـل لـیمکین) لـە مەدریـد لـە کۆنفراسـێکدا لـە سـاڵی ١٩٣٣ بەکاریهێناوە و لەساڵی ١٩٤٢ بەنوسین تۆماریکردوە. ئەم یاساناسـە تـەواوی خێزانەکەی بە دەستی ئەڵمانەکان لەناوبردراون.

### جۆرەکانی جینۆساید:

١. **جینۆسـایدی جەسـتەیی:** بریتییـە لـە کوشـتن و لـەناوبردنی تاکـەکانی کۆمـەڵ، بەشـێوەیەکی راسـتەوخۆ یـا ناڕاسـتەوخۆ، وەك (گوللـەبارانکردن، زیندەبەچاڵکردن، شوبنزکردن، لەسێدارەدان و بـەکارهێنانی چـەکی کۆکـوژ. بۆنمونە کیمیابـارانکردنی گونـدو لادێکـان و شـاری هەڵەبجـە لـە کوردسـتان، لەلایەن رژێمی عێراق و بەکارهێنانی چەکی فسفۆری و ژەهراوی دژ بـە گـەلی کـورد، زیندەبەچـاڵکردنی ئـەنفالکراوەکان لـە بیابانـەکانی رۆژئـاوای عێـراق. کوشـتن و لـەناوبردنی نێرینـەی بارزانییـەکان و گەنجـە کـوردە فەیلییـەکان،

بۆردومـانکردنی شـاری قـەڵادزێ بـە بـۆمبی ناپـاڵم، ئەمانـە دیـارترین جـۆری پاکتاوی جەستەیین دژ بە گەلی کورد لە عێراق

**٢. جینۆسایدی بایەلۆژی:** ئەم جۆرەیان بریتییە لە رێگرتن لە وەچەنانەوە و زۆربوون و گەشەسەندنی کۆمەڵە مرۆڤێکی یەك رەگەز بەهۆی نەزۆك کـردن و لەباربردنی ئافرەت و خەساندنی پیـاوان و لێـك جیاکردنـەوەی ژن و پیـاو بـۆ ماوەیـەکی درێـژ. ئـەم تاوانانـە لـە شـاڵاوەکانی ئـەنفال لـە سـاڵی ١٩٨٨ لـە کوردسـتان پـەیڕەوکران، بەتایبـەتی لـە مەڵبەنـدەکانی کۆکردنـەوەی ئـەنفالکراوەکان لـەکاتی جیاکردنـەوەی پیاوەکـان لـە ژنـەکانیان، بەهـەمان شێوە جیاکردنەوەی نێرینەی بارزانییەکان لە خێزانەکانیان لە ساڵی ١٩٨٣.



دەرکردنی پیر و منداڵانی کورد و زیندە بەچاڵکردنی گەنجەکان لە گۆڕی بەکۆمەڵ

**٣. جینۆسایدی کولتوری:** قەدەغە کردنی زمانی زگماك و شێواندنی مێژوو و کولتوری کۆمەڵە مرۆڤێك و سڕینەوەی شوێنەواری شارستانی و مێژوویی دەگرێتەوە. لە وێرانکردن و شێواندنی شوێنە دێرینەکان، کە پاشماوەی کۆن و نوێی دانیشتوانی ناوچەکەن، وەك روخاندنی مزگەوت و کلێسە و قەلاّ دێرینەکان و پەیکەرەکان، کە ناسنامەی مێژوویی دانیشتوانی ناوچەکەن. لەلایەن زۆربەی نەتەوە بالاّ دەستەکانەوە هەوڵی بێوچان دەدرێت بۆ پشتگیری دەسەلاّتەکانیان لە پاکتاوکردنی رەگەزی و نەتەوەیی، بۆ تواندنەوەی زمان و رۆشنبیری و مێژووی ئەو نەتەوانەی کە لەناو نەتەوە زۆرینەکاندا دەژین. جینۆسایدی کولّتوری لەزۆر شوێنی جیهاندا پەیڕەو دەکرێت، وەك لە تورکیا و ئێران و عێراق و سوریا دەرهەق بە گەلی کورد دەکرێت، لە باکووری ئەفریقیا دژ بە ئەمازیغەکان و لە سودان دژ بە دانیشتوانی دارفور و لە میانمار دژ بە موسڵمانەکانی ئەو ولاّتە دەکرێت...هتد.

نمونە لە کوردستان زۆرە بەرامبەر ئەو رەفتارانەی کە رژێمەکانی عێراق و ئێران و تورکیا و سوریا بەرامبەر بە گەلی کورد کردویانە.

لە عێراق لەسالاّنی هەشتاکان رژێم هەڵسا بە دووبارە نوسینەوەی مێژوو، بە شێوەیەك کە لە خزمەتی بیروبۆچونی بەعس بێت...هتد.

لە تورکیا کوردەکان لە ناو و ناونیشانی خۆیان بێبەشکران، (کوردی چیایان) بەسەردا چەسپاندن. لە ئێران کورد بە هۆزێکی ئێرانی کۆن دانراوە و زمانی کوردیش بە دیالێکتێکی زمانی فارسی دانراوە. لە سوریاش کوردەکان لە

زێدی باب و باپیرانیان بە بێگانە دادەنرێن و تەنانەت ناسنامەی هاووڵاتی بوونیشیان لێسەندرایەوە...هتد.

**٤. جینۆسایدی ئابووری:** بریتییە لە برسیکردنی دانیشتوان لەرێگای تەختکردنی کێڵگە کشتوکاڵیەکان و لەناوبردنی سەرچاوە ئاوییەکان و رێگا گرتن لە کارکردن بۆ بژێوی ژیان و لەناوبردنی هۆکارەکانی بەرهەمهێنانی کۆمەڵە خەڵکێك. ئەم جۆرەیان وەکو جۆرەکانی تر زۆر بەئاشکراو روون لە کوردستان بەرچاو دەکەوێت. پتر لە (٤٥٠٠) چوار هەزار و پێنج سەد گوندی کوردستان لەگەڵ زەوی تەختکران. مرۆڤەکان کە دەستی کار بوون زۆربەیان لەناوبردران، بە زیندەبەچاڵکردن و لەسێدارەدان و گوللەبارانکردن...هتد. هەرچی ماڵ و سامانیشیان هەبوو لە ناوچەکە کەوتنە بەر شاڵاوەکانی ئەنفال هەمووی بە تاڵان بردران.

ئەم تاوانانە تەنها لە میانەی شاڵاوەکانی ئەنفال ئەنجام نەدراوە، بەڵکو لە پێشتریش بەرامبەر بە کوردە فەیلییەکان و بارزانییەکان ئەنجامدراوە، لە ساڵانی (١٩٨٠ – ١٩٨٣)، هەرچی هەیانبوو دەستی بەسەر داگیرا و بەتاڵان بردرا و خەڵکەکەشی چاوەڕوانی ژەمە خواردنێك بوون، ئەگەر رژێم پێیبدابانایە.

گەمارۆی ئابووری شێوازێکی نامۆ نەبووە دژ بە کۆمەڵگەی کوردی، کە بەردەوام رژێمەکانی عێراق، بۆ چۆك پێدانی گەلی کورد و بزوتنەوە رزگاریخوازەکەی پەیڕەویان کردووە، لە برسیکردن و وێرانکردنی سەرچاوەکانی داهاتی ژیانی کۆمەڵی کوردەواری.

**رژێمی عێراق بۆ پەیڕەوکردنی جینۆسایدی ئابووری بەرامبەر بە گەلی کورد چەندین شێوازی گرتەبەر کە ئەمانەن:**

١. سەپاندنی گەمارۆی ئابووری بەسەر کوردستان بە گشتی و ناوچە ئازاد کراوەکان بەتایبەتی.

٢. مین ڕێژکردنی زۆربەی زەوییە کشتوکاڵییەکانی ناوچە شاخاوییەکان، کە سەرچاوەی بژێوی دانیشتوانەکەی بوو.

٣. تەقاندنەوە و کوێرکردنەوەی زۆربەی سەرچاوە ئاوییەکان و ژاراویکردنی کانیاوەکان.

٤. سوتاندنی ڕەز و باخ و پاوان و زەوییە کشتوکاڵییەکان و بڕینەوەی دارستانەکان بەمەبەستی لەناوبردنی سەرچاوەکانی داهاتی ژیانی دانیشتوانی ناوچەکە.

٥. بەزۆر ڕەوانەکردنی پیاوانی ناوچە کوردیەکان بۆ ڕیزی سوپا و سوپای میللی(الجیش الشعبی) و جاشایەتی، بەتایبەتی لەکاتی شەڕەکانی ڕژێم لەگەڵ ئێران یا لەگەڵ پێشمەرگە.

بەڵام لە ساڵی ١٩٨٨ لەمیانەی شاڵاوەکانی ئەنفال، ڕژێم بێگوێدانە هیچ یاسا و ڕێسایەك، هەرچی ژێرخانی ئابووری کوردستان هەبوو بەتەواوی وێرانکرد، بەجۆرێك ئەگەر چەندین ساڵ بنیاتنانەوەی بۆ بکرێت، نەگەڕێتەوە ئاستی پێشوو.

## ڕێکەوتنامەی قەدەغەکردنی جینۆساید:

بەهۆی ئەو تاوانە گەورانە و کۆمەڵکوژیانەوە، کە لەدژی مرۆڤایەتی ئەنجامدرا، چ لەمیانەی جەنگی دووەمی جیهانی یا لەدوای جەنگەکە، کە بە

ملیۆنان مرۆڤ بوونە سوتەمەنی سیاسەتە ڕەگەز پەرستەکان بۆ لەناوبردنی نەتەوە ژێردەستەکان. جا بۆ ئەوەی ڕێگا لە دووبارە بوونەوەی شەڕ و نەهامەتییەکان بگیرێت، هەر لەم چوارچێوەیەدا کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان لە دەسپێکی ڕێکەوتنامەی قەدەغەکردنی تاوانی جینۆساید دا بەبڕیاری ژمارە (٩٦)ی ڕۆژی ١١ی کانونی یەکەمی ١٩٤٦ بەپێی یاسا، جینۆساید بە تاوانێکی نێودەوڵەتی داناوە، چونکە ئەو تاوانە پێچەوانەی ئامانجەکانی نەتەوە یەکگرتووەکانە.

لەبەر گرنگی ئەو ڕێکەوتنامەیە، ئاماژە بە ناوەرۆکی مادە گرنگەکان دەکەین:

**مادەی یەك:** لایەنەکانی ڕێکەوتنامەکە ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی کە جینۆساید تاوانێکی نێودەوڵەتییە، چ لەکاتی شەڕ یا لە ئاشتیدا ئەنجامدرابێت، بۆیە بەڵێنی قەدەغەکردنی تاوانی جینۆساید و سزادانی ئەنجامدەرانیان داوە.

**مادەی دوو:** جینۆساید ئەم تاوانانەی خوارەوە دەگرێتەوە، کە بە مەبەستی لەناوبردنی بەشێك یان کۆمەڵێکی نەتەوەیی یان ڕەگەزێك ئەنجام درابێت، بریتین لەمانە:

١. کوشتنی ئەندامانی کۆمەڵێك.

٢. زیان پێگەیاندنی جەستەیی یا گیانی بە ئەندامانی کۆمەڵێك.

٣. جیاکردنەوەی کۆمەڵە خەڵکێك لە هەڵ و مەرجێکی بژێوی دژوار و سەخت، بۆ لەناوبردنی بەشێکیان یان هەموویان.

٤. کۆسپ دانان لەبەردەم زیادبوون (زاوزێ) لە کۆمەڵێکدا.

٥. دابڕینی منداڵان لە دایك و باوکیان (خێزان)، بۆ کۆمەڵێکی تر.

**مادەی سێ:** ئەنجامدەرانی ئەم تاوانانەی خوارەوە سزا دەدرێن:

١. ئەنجامدانی جینۆساید.

٢. پیلان گێڕان بۆ ئەنجامدانی جینۆساید.

٣. هاندانی راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ بۆ ئەنجامدانی جینۆساید.

٤. هەوڵدان بۆ ئەنجامدانی جینۆساید.

٥. بەشداریکردن لە جینۆساید.

**مادەی چوار:** هەر تاوانێك لەو تاوانانەی کە لە مادەی سێدا ئاماژەی پێکراوە بەپێی رێکەوتنامەکە سزا دەدرێن، ئینجا ئەو کەسانە دەسەلاّتداری دەستووری یاخود فەرمانبەری گشتی یاخود تاکی ئاسایی بن.

ئەنجامدەرانی تاوانەکە لە هەر پۆستێك بن لەوانەی ئاماژەی پێکراوە، پارێزراو نابن (**حصانة**)، لەو تاوانانە نابەخشرێن.

**مادەی پێنج:** هەموو ئەو ولاّت و لایەنانەی کە رێکەوتنامەکەیان مۆرکردووە، پابەندی خۆیان و ولاّتەکانیان دووپات کردۆتەوە بۆ جێبەجێکردنی ناوەرۆکی رێکەوتنامەکە، بەتایبەتی سزادانی ئەنجامدەرانی تاوانی جینۆساید و هەر تاوانێك لە تاوانەکانی مادەی سێ.

**مادەی شەش:** ئەنجامدەرانی هەر تاوانێك کە لە مادەی سێی تاوانی جینۆساید دا هاتووە. لە بەردەم دادگایەکی ناوخۆی تایبەتی ئەو ولاّتەی کە تاوانەکەی لەسەر خاکەکەی ئەنجامدراوە دادگایی دەکرێن، یاخود لە بەردەم دادگایەکی تاوانی نێودەوڵەتی دادگایی دەکرێت، ئەگەر نەتوانرا لە دادگایەکی ناوخۆ دادگایی بکرێت.

**مادەی حەوت:** ئەو تاوانانەی کە لە مادەی سێی جینۆساید، ئاماژەی پێکراوە بە تاوانی سیاسی دانانرێت و ئەنجامدەرانی تاوانەکە ناتوانن لە ولاّتانی تر مافی پەنابەری سیاسی وەربگرن، چونکە دەوڵەتانی ئەندام لەم رێکەوتنامەیە بەڵێنیان مۆرکردووە، کە تاوانبارانی جینۆساید و تاوانەکانی تریش رادەستی ولاّتەکانیان بکەنەوە.

**مادەی هەشت:** هەر لایەنێکی رێکەوتنامەکە بۆی هەیە داوا لە دامەزراوە تایبەتمەندەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان بکات، کە بەپێی پەیماننامەی نەتەوە یەکگرتووەکان هەر رێوشوێنکی گونجاو بگریتەبەر بۆ قەدەغەکردن و سەرکوتکردنی تاوانەکانی جینۆساید یاخود هەر تاوانێك لە تاوانەکانی مادەی سێی رێکەوتننامەکە.



گۆری بەکۆمەڵی قوربانیانی کیمیابارانی هەڵەبجە

**مادەی نۆ:** لە سەر داوای هەر لایەنێکی ناکۆك بۆ کێشەکانی نێوان ئەندامانی ڕێکەوتننامەکە دەتوانرێت داوا لە دادگای نێودەوڵەتی بکرێت، پەیوەست بە شیکردنەوە یاخود جێبەجێکردنی بەندەکانی ڕێکەوتنامەکە یاخود پەیوەست بەو کێشانەی پەیوەندی بە لێپرسراوێتی هەر دەوڵەتێکەوە هەیە لە بواری جینۆساید یاخود هەر تاوانێك لەو تاوانانەی لە مادەی سێی ڕێکەوتنامەکەدا هاتووە.

**مادەی دە:** بەپێی ڕێکەوتنامەی بەسەر نەچوونی تاوانەکانی جەنگ و تاوانەکانی دژ بە مرۆڤایەتی، تاوانی جینۆساید بە تێپەڕبوونی کات بەسەرناچێت.

واتە تاوانی جینۆساید چەند کۆنیش بێت، بەسەرناچێت و ئەنجامدەرانی دادگایی دەکرێن.

جینۆساید لە یاسای نێودەوڵەتی وەکو تاوانێکی سەربەخۆ، کە تایبەتمەندی جیاوازی هەیە لەگەڵ

تاوانی تر. **بۆیە لە تاوانی جینۆساید دوو پێکهاتەی زۆر گرنگ هەیە:**

**١. ئامانج:** ئەم تاوانە لە تاوانی تر جیاوازە، چونکە مەبەستی سەرەکی جینۆساید لەناوبردنی بەشێك یا سەرجەمی کۆمەڵە مرۆڤێکە. بۆیە ئامانجی نەهێشتنی کۆمەڵە مرۆڤێك، بەشێکی بێت یا سەرجەمی، تایبەتمەندی بە جینۆساید دەدات و لەتاوانی دیکەی جیا دەکاتەوە.

**٢. لە رووی ژمارە:** لەبەر ئەوەی جینۆساید، ئامانجی لەناوبردنە، بۆیە ژمارەی قوربانیان لە بەرچاو ناگیرێت. کەواتە تەنیا پێشنیارکردن بۆ لەناوبردنی هەر کۆمەڵە مرۆڤێك بێت، ئیتر مەبەستەکە دروست دەبێت. ئەنجامدانی تاوانەکەش مەرج نییە، ژمارەی قوربانیانی زۆری هەبێت، کەم و زۆر گرنگ نییە و لە بەرچاو ناگیرێت بۆ دیاریکردنی تاوانی جینۆساید و ئەنجامدەرانی تاوانەکە.

## سیاسەتی پەیڕەوکردنی جینۆساید لە کوردستان:

لە چوارچێوەی سیاسەتی ئەو وڵاتانەی کە کوردستانیان بەسەر دابەشکراوە: (عێراق، ئێران، تورکیا و سوریا)، کێشەی کورد تاکو ئێستا بەبێ چارەسەر ماوەتەوە و نەتەوەی کوردیش بە دابەشکراوی بەر پەلاماری دڕندانە و پاکتاوکردنی رەگەزی بۆتەوە، بۆیە گەلی کورد وەکو نەتەوەیەکی ژێردەستە کەوتۆتە بەر مەترسیەکی گەورە لە رووی مێژوو و کولتوور و ئابووری، کوردستان وا شێواندراوە رۆژ لەدوای رۆژ تایبەتمەندییەکانی زیاتر تێکدەچێت.

سیاسەتی ئەو وڵاتانەی کە کوردستانیان بەسەر دابەشکراوە، بریتییە لە وێرانکردنی شارستانیەت و کولتووری کورد، هەردەم هەوڵیان داوە راستییە مێژووییەکان بشارنەوە، کە گەلی کورد لەنەتەوە هەرە دێرینەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستە.

## تاوانەکانی جینۆسایدی گەلی کورد لە عێراق :

هەروەك لە بەشی یەکەم ئاماژەمان بۆکرد، لە سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق و لکاندنی باشووری کوردستان بە وڵاتی عەرەبی عێراق، کێشەی کورد بۆتە کێشەی سەرەکی عێراق. حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق نکۆڵیان لە مافی گەلی کورد کردووە لە دیاریکردنی چارەنوسیدا، سیاسەتێکی بەرنامەڕێژیان داناوە بۆ تواندنەوەی نەتەوەی کورد لە بۆتەی (بەعەرەب بوون)دا، لە چوارچێوەی دەوڵەتی عێراقی عەرەبیدا.

لە ساڵانی ١٩٣٣ — ١٩٣٤ بۆ دامرکاندنەوەی راپەڕینی بارزان لە ناوچەکانی (بەرۆژ و مزووری و شێروان)، (٧٩) حەفتاو نۆ گوندیان وێرانکرد. لە سەرەتای هاتنە سەر حوکمرانی حەرەس قەومییەکان لە ساڵی ١٩٦٣ نزیکەی (٢٠٠) دووسەد گوند سوتێنرا و زیاتر لە (٢٠٠٠) دوو هەزار کەسیش کوژران. هەر لەم ماوەیەدا بە سەدان کەس لە تەمەن و چین و توێژی جیاواز دەسگیرکران.

لە دەشتی کەندێناوەی سەر بە پارێزگای هەولێر، ژمارەیەك گوند سوتێنران و وێرانکران. لە دەوروبەری شاری کەرکوك نزیکەی (٤٠٠٠٠) چل هەزار کەس لە زێدی خۆیان دەرکران و خێڵی عەرەبیان لە جێگا نیشتەجێکردن.

خوێندن بە زمانی زگماکی کوردی قەدەغەکرا، ناوی گوندەکانیش بەعەرەبکران. ئەم تاوانانە ناوچەی شەنگالیشی بەچڕی گرتەوە، هەروەك لە بابەتەکانی پێشوو ئاماژەمان پێکردووە. لەساڵی ١٩٦٨ لەدوای دەست بەسەر دەسەڵات داگرتنی عێراق لەلایەن بەعسیەکانەوە تاوانەکە زیاتر

تەشەنەیکرد. لە ساڵی ١٩٦٩ سوپای عێراق هێرشی سەرتاسەری بۆ سەر ناوچە ئازادکراوەکان راگەیاند، هەرچی کەوتە سەر رێگایان تالآنیان کرد و ئاگریان تێبەردا، هەتا مرۆڤی ناوچەکەش لەو سووتاندنە رزگاریان نەبوو، تەنیا لە ئەشکەوتی (دەکا )، کە دانیشتوانی دوو گوندی ئەم ناوە لە ترسی سوپا خۆیان تێدا حەشار دابوو، (٦٧) شەست و حەوت کەس، لە ژن و منداڵی لەناو ئەشکەوتەکە سوتاند. لە ساڵانی (١٩٧١ ــ ١٩٧٣)، تاوانی دەرکردنی کوردە فەیلیەکان بۆ ئێران و سەندنەوەی رەگەزنامەی عێراقی، دەرکردنی کرێکار و فەرمانبەر و خێزانە کوردەکان لە کەرکوك و خانەقین.

لەساڵی ١٩٨٣ دەزگاکانی رژێم لە کۆمەڵگە زۆرەملێیەکانی دەوروبەری هەولێر (٨٠٠٠) هەشت هەزار نێرینەی بارزانییان برد و شونبزریان کردن.

لەساڵانی (١٩٨٧ - ١٩٨٨) تاوانەکانی جینۆساید گەیشتە لوتکە، بەشێوەیەکی فراوان چەکی کیمیاوی لە کوردستان بەکارهات، کە هەزاران کەس بوونە قوربانی. ئەم بابەتانەمان بە درێژی لە بەشەکانی پێشوو باسکردوە، کە بە ئاشکرا تاوانەکانی جینۆسایدی گەلی کورد دەسەلمێنێ. تاکو ئێستاش رزگار بوانی ئەم تاوانە پێوەی دەناڵێنن.

## تاوانی جینۆساید لە بەشەکانی دیکەی کوردستان:

### جینۆسایدی کورد لە باکووری کوردستان:

لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانی و هەڵوەشاندنەوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و دامەزراندنی دەوڵەتی نوێی تورکیا (کۆماری تورکیا)، سیاسەتی فەرمانڕەوا تازەکانی تورك، هەمان شێوەی سیاسەتی فەرمانڕەواکانی عێراق بوو، بگرە زیاتر و دڕندانەتریش بۆ لەناوبردن و سڕینەوەی نەتەوەی کورد لە

تورکیا، کە کوردیان بە (تورکی چیا) دەناساند، ئەمەش بووە هۆی پەراوێزکردن و بێبەش کردنی گەلی کورد لە باکووری کوردستان لە هەموو مافێکی نیشتمانی و نەتەوەیی. بە راگواستن و لەناوبردنی دانیشتوانی کورد و دوورخستنەوەیان بۆ ناوچەکانی تری تورکیا، کە تورک زۆرینەن و نیشتەجێکردنی تورك لە جێگایان بە مەبەستی شێواندنی دیمۆگرافیای کوردستان و لە ناوبردنی تایبەتمەندی کولتووری و مێژوو و کۆمەلآیەتی شار و شارۆچکە کوردییەکان کە زۆربەی ناوچەکەی گرتەوە، وەك (بەتلیس، ئامەد، وان، هەکاری، موش، ماردین، ئورفە و سیرت ...هتد.

بێجگە لەمانە قەدەغەکردنی زمانی زگماك و جل و بەرگ و ناوی کوردی. سیاسەتی تورك پشتی بەستووە بە دەستووری سالّی ١٩٢٤، کە تیایدا هاتووە جگە لە تورك دان بەهیچ گەل و نەتەوەیەکی غەیرە تورك دانانرێت.

لەدوای سەرکوتکردنی راپەرینی کوردان، کە شێخ سەعید رابەرایەتی دەکرد، لە سالآنی (١٩٢٥ ــ ١٩٢٦)، سەدان گوند و کێلّگەی کشتوکالّی وێرانکران و مالّەکانیشیان سوتێنران و تالآنکران و دانیشتوانەکەشیان بۆ ناوچەکانی تری رۆژئاوای تورکیا راگوێزران، کە ژمارەیەکی زۆریان لە برسان و لە سەرمان مردن.

جینۆسایدی گەلی کورد لە یاسای ژمارە ( ٨٨٥ ی ٣١ /٥/١٩٢٦ )، ئەنجومەنی گەورەی نیشتمانی تورکیا جێگیرکراوە. بەگوێرەی ئەم یاسایە پەلاماردانی سەر ناوچە کوردییەکان رەوایە.

لەکاتی هەلّگیرسانی راپەرینی (ئاگری داغ ١٩٢٧ ــــ ١٩٣٠)، سەرجەم دانیشتوانی (٢٢٠) دوو سەد و بیست گوندی ئەو ناوچانەی کە راپەرینەکەی

گرتبۆوه، نزیکەی (١٠٠٠٠) ده هەزار کەس دەبوون، هەموویان شونبزرکران. هەر بۆ تۆقاندن نزیکەی (١٠٠) سەد روناکبیری کوردیان بەدەست و پێ بەستراوەی فڕێدایە ناو دەریاچەی (وان). لە ١٩٣٠/١/١، رژێمی تورکیا بڕیاری بە زۆرکۆچ پێکردنی دانیشتوانی هەرێمی دەرسیمی دا. دوای سەرکوتکردنی راپەڕینی دەرسیم لەساڵی ١٩٣٧ کەمالیەکان، بە ئاگر و ئاسن بەربوونە گیانی کورد، (١٥٠٠) هەزار و پێنج سەد پیرەژن و گەنج و منداڵ بەدەست بەستراوی خرانە چاڵێکی گەورەوە و نەوتیان بەسەر داکردن و ئاگریان تێبەردان.

جێی ئاماژە پێدانە، دەربارەی کۆمەڵکوژییەکەی دەرسیم، سەرۆك وەزیرانی تورکیا لە ساڵی( ٢٠١٢ ) داوای لێبوردنی لە کەسوکاری قوربانیانی دەرسیم کرد. ئەم هەڵوێستە خۆی دانپێدانانە بە جینۆساید کردنی کورد لە باکووری کوردستان.

تورکەکان بەردەوام خەریکی سیاسەتی بەتورك کردن و راگواستن و سڕینەوەی سیمای نەتەوەیی ناوچە کوردییەکانن، کە تائێستا حوکمی عورفی بەسەر ناوچەکەدا جێبەجێ دەکرێت، رۆژانە چەندین گەنج و لاوی ئەم ناوچانە دەکەونە بەر شالاوی گرتن و لەناوبردن.

### جینۆسایدی کورد لە رۆژهەڵاتی کوردستان:

کوردانی بەشی رۆژهەڵاتیش تووشی هەمان سیاسەتی پاکتاوی رەگەزی بوونەتەوە، لەلایەن دەسەڵاتدارانی ئێرانی. لەنێوان هەردوو جەنگی جیهانیدا، حکومەتی ئێرانی سیاسەتێکی توندی دژ بە کورد ئەنجامدا، لە راگواستنی بەزۆر بۆ ناوچە جیاوازەکانی ئێران.

لەساڵی ١٩٣٥ بەشێکی زۆری (گەڵباخ و جەلالی و پیران)، بۆ (سوڵتان ئاباد و کرمان و شیراز) راگوێزران. هۆزی جەلالی کە لەسنوری ئێران ــ تورکیا و ئازەربایجان دەژیان، نزیکەی (١٠) دە هەزار کەسیان بۆ ناوەڕاستی ئێران راگوێزران. سیاسەتی رژێمی شای پەهلەوی دانی بەبوونی کورد نەدەنا، کوردیان بە یەکێك لە هۆزەکانی ئێران و زمانی کوردیش بەیەکێك لە شێوە زارێکی زمانی فارسی دادەنا. لەدوای روخاندنی کۆماری کوردستان لە مهاباد، لە ساڵی (١٩٤٦) زۆر دڕندانە کەوتە گیانی دانیشتوانەکەی و ناوچەکەشی وێرانکرد و زمانی کوردی قەدەغەکرد و کەوتە شێواندنی باری کۆمەڵایەتی و کولتووری و داتەپاندنی ئابووری. ئەم بەشەی کوردستانیش، ژیانیان لە بەشەکانی تری کوردستان باشتر نەبووە. تا ئێستا کورد ئاوارە و دەربەدەر دەبێت. سیاسەتی جیاوازی مەزهەبی و نەتەوەیی بەسەردا دەچەسپێ و رۆژانە گەنجان بەرەو زیندانەکانی رژێم راپێچ دەکرێن.

### جینۆسایدی کورد لە رۆژئاوای کوردستان:

کورد لە رۆژئاوای کوردستان (سوریا)، بەردەوام لە چەوسانەوەی نەتەوەیی بووە، شێوازی جینۆسایدی کولتووری و نەتەوەیی لە دژ پەیڕەو کراوە، بە دابڕینی ناوچە کوردیەکان لەگەڵ یەکتری، ئەویش بە نیشتەجێکردنی هۆزە عەرەبەکان لەنێوان کوردانی باکوور و رۆژئاوا، وەك پشتێنەیەك بۆ لێك دابڕینی نەتەوەی کورد و جوگرافیاکەی و پەیڕەوکردنی لەناوبردن و نەهێشتنی زمانی کوردی.

لە ساڵانی (١٩٤٥ ــ ١٩٥٨) رژێمی سوریای عەرەبی زۆربەی ئەفسەرە کوردەکانی لە سوپا دەرکرد.

لە سەرژمێری ساڵی ١٩٦٢ زیاتر لـە دوو سـەد هـەزار کـەس لـە دانیشـتوانی پارێزگـای جـەزیرە، مـافی هاونیشـتمانی بوونیـان لێسـەندرایەوە، وەك لـێ سەندنەوەی مافی ژیان، چونکە مافی کارکردن و کـڕین و فرۆشـتن و ژنهێنـان و شووکردن و دامەزراندنیان نامێنێ. جگە لەمەش ناوی گوند و ناوچـە و شـارە کوردیەکانی گۆڕی بۆ عەرەبی.

لەمیانەی بابەتەکانمان دەردەکەوێت کە ئەو رژێمانـەی کوردستانیان بەسـەر دابەشکراوە، هـەمان سیاسـەتی پاکتـاوکردنی رەگـەزیان دژ بـە گـەلی کـورد پەیڕەو کـردووە. چـەندین شـێوازیان بـەکارهێناوە بـۆ سـڕینەوەی نەتـەوەی کورد، بۆیە بەردەوام لە دژایەتی کردنی کورد هاوکار و هاوڕا بوونە و پـەیمان و بەڵێنیان لەنێوان خۆیاندا بەستووە. هـەر یـەك لـەو وڵاتانـەی ئـەو بەشـەی کوردستانیان بەرکەوتووە، بەهیچ جۆرێك بە خاکی کوردی نازانێـت و دانـیش بە مافەکانی گەلی کورد نانێن.



لە کۆڕەوی ساڵی ١٩٩١ دا

## پرسیارەکانی بەشی شەشەم

**پ١. ئەم زاراوانە پێناسە بکە :**

جینۆساید، جینۆسایدی جەستەیی، جینۆسایدی بایەلۆژی ، جینۆسایدی کەلتووری، جینۆسایدی ئابووری، تورکی چیایی، راپەڕینی دەرسیم .

**پ٢. جینۆساید لە یاسای نێودەوڵەتی وەکو تاوانێکی سەربەخۆ ، تایبەتمەندی جیاوازی هەیە لەگەڵ تاوانی تر . ئایا ئەم تایبەتمەندیانە چین ؟**

**پ٣. رژێمی عێراق بۆ پەیرەوکردنی جینۆسایدی ئابووری بەرامبەر بە گەلی کورد چەندین شێوازی گرتە بەر ،بە وردی رونیان بکەوە.**

**پ٤.ئەم بۆشایانەی خوارەوە پڕبکەوە .**

١. جینۆساید ئەم تاوانانەی خوارەوە دەگرێتەوە ،کە بریتین لە ١....... ٢.........٣.....٤....٥.

٢. بەپێی مادەی سێ ئەنجامدەرانی ئەمانەن کە سزا دەدرێن ١.....٢....٣......٤....٥....

# سەرچاوەکان

١. ئـەمیر قـادر: دۆزی جینۆسـایدی خـەڵکی کوردسـتان: کـۆنگرەی بەجیهانناسـاندنی جینۆسایدی گەلی کورد: هەولێر، ٢٠٠٨,

٢. پ. ی. د. سەعدی عوسمان هەروتی: سیاسەتی پاکتاوی رەگەزی کـورد لـە کـەرکوك لە سالأنی دوای راپەڕیندا: کۆنگرەی بەجیهانناساندنی جینۆسایدی گەلی کورد: هـەولێر، ٢٠٠٨,

٣. د. مارف عومەر گوڵ، جینۆسایدی گەلی کورد، هەولێر، ٢٠١٠,

٤. دراسه عن الكورد الفيلين http://www.kurdefrin.com/vb/t7411.html

٥. رێکاریٚ مزویری: شێواز و میکانزمی جینۆساید و دیمۆسایدی بارزانییەکان: کۆنگرەی بەجیهانناساندنی جینۆسایدی گەلی کورد: هەولێر، ٢٠٠٨,

٦. رێکاریٚ مزویری: ئەنفال و کۆمکوژی و کاریگەرییێن دەروونی، هەولێر، ٢٠١١,

٧. رێبوار رەمەزان عەبدوڵلاّ: باروقی لەناوبردنی بارزانییەکان، چاپی یەکەم، ٢٠١٢,

٨. رێبـوار رەمـەزان عەبـدوڵلاّ: جینۆسـایدکردنی بارزانییـەکان لـە سـەدەی بیسـتەمدا. هەولێر، ٢٠١١,

٩. رێکخراوی V.i.s.d.p. ئەڵمانی، وەرگێڕانـی لـە ئەڵمانییـەوە: ناسـح ئیـبراهیم دزەیـی: کوردستان گەورەترین هێرش بەچەکی کوشندەی کیمیاوی، دهۆك، ٢٠٠٨,

١٠. جاسـم محەمـەد محەمـەد عـەلی: جینۆسـایدی دانیشـتوانی پارێزگـای سـلێمانی، کۆنگرەی بەجیهانناساندنی جینۆسایدی گەلی کورد: هەولێر، ٢٠٠٨,

١١. خەبات عەبدوڵلاّ: هەڵەبجە ... مەملەکەتی ژیان، سلێمانی، ٢٠١٠,

١٢. خەلیل عەبدوڵلاّ: بەجینۆسایدناسینی ئەنفال، سلێمانی، ٢٠١١,

١٣. فریشتە کەوە: کارەساتی هەڵەبجە، هەولێر، ٢٠٠٨,

١٤. فرمان عبدالرحمن: پاکتاوی رەگەزی کورد لە کوردستانی عێراقدا، سلێمانی، ٢٠٠٦,

١٥. مهاباد قەرەداغی، کارەساتی ئەنفال و کاریگەرییە دەروونییەکانی لەسەر کۆمەڵگەی کورد: کۆنگرەی بەجیهانناساندنی جینۆسایدی گەلی کورد: هەولێر، ٢٠٠٨,

١٦. میدل ئیست ووّچ: وەرگێڕان محەمەد حەمە ساڵح توّفیق، جینوّساید لە عێراقدا، سلێمانی، ٢٠٠٤.

١٧. مایکل لیزنبێرگ، ئەنفال لە کوردستانی عێراق، وەرگێڕانی کارزان محمد: سلێمانی، ٢٠١١.

١٨. یوسف دزەیی: ئەنفال، کارەسات و ئەنجام و رەهەندەکانی: هەولێر، ٢٠٠١.

١٩. المحامي طارق جامباز: ضحايا عمليات الانفال ١٩٨٨ من المسيحين و الايزدين، أربيل، ٢٠٠٨.

٢٠. خالد المرسومى: واقع الكرد الفيلين بين الاقصاء والقوانين، العدد السادس لمجله "تضامن" أيلول ٢٠٠٨.

٢١. الكورد الفيليون من تفرعات الشعب الكوردى العريق فى التاريخ

24 http://www.kurdefrin.com/vb/t7411.html. د. احمد راسم النفيس، من هم الكرد الفيليون؟ http://annabaa.org/nbahome/nba72/kurd.htm

٢٢. اليزابيث كامبل، كورد فيلى، ترجمه: ديارى صالح مجيد : http://nihadtuz.forumarabia.com/t24

٢٣. ضياء السورملي: الكرد الفيلية حقائق و مواقف:Kadhem English - Arabic Kurdish

٢٤. سەردار محمد عبدالرحمن، هوشیار محمدامین خوّشناو، نەخشەی (بەعەرەبکردن، ئەنفال، کوّمەڵگە زوّرەملێیەکان،کیمیاباران): ئەتلەسی هەرێمی کوردستانی عێراق، عێراق و جیهان، کوّمپانیای تێنوس بوّ چاپەمەنی و کاری هونەری، هەولێر، ٢٠٠٩.

٢٥. سەردار محمد عبدالرحمن، هوشیار محمدامین خوّشناو، (ئەتڵەسی مێژووی بزاڤی رزگاریخوازی کوردستان، کوّمپانیای تێنوس بوّ چاپەمەنی و کاری هونەری، بەرگی یەکەم، هەولێر، ٢٠١٢.

٢٦. وەزارەتی کاروباری شەهیدان و ئەنفالکراوەکان: پڕوّژەی ئەرشیفکردنی جینوّسایدی گەلی کورد، زنجیرە(٦) هەولێر، ٢٠٠٨.

٢٧. عومەر محەمەد: کوّمەڵکوژیی بارزانییەکان بە ئەنفال ناوبەرین یا بەجینوّساید، گوّڤاری ئەنفالستان، ژمارە (٩) Anflistan@yahoo.com ، چاپخانەی رەنج.

